1

# خۆری ئیسلام

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری و ئاینی ئیسلامی وەرزییە
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات

ساڵی یەکەم/ ڕەبیعول ئەوەڵ/ ١٤٢١ ك
پوشپەڕی ٢٦٩٨ی کوردی - تەمموزی ١٩٩٨ز

## پیرۆزبێت یادی لەدایک بوونی پێغەمبەری پێشەوامان محەممەد(د.خ)

بەڕێز د. ڕۆژ نوری شاوەیس :

**پێویستە بەرامبەر دوژمنانمان یەکگرتوو بین لە پێناو چەسپاندنی ئاشتی و یەکگرتنەوەی هەرێمی کوردستان**

بەڕێز فازیل میرانی :

**مەلا مستەفای نەمر باشترین پشتیوان بووە بۆ ئەوانەی لە مینبەر رادەوەستن**

بەڕێز مەحمود حەفیدزادە :

**بارزانی نەمر پێڕۆکەی دامەزراندنی یەکێتی زانایانی ئاینی لە کوردستانی عێراقدا بردە ئەنجامی واقیع**

# خۆری ئیسلام 1



گۆڤارێکی رۆشنبیری و زانستی ئیسلامی وەرزییە
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات

سالی یەکەم
رەبیعولئەوەلی ١٤١٩ك - تەمووزی ١٩٩٨ز
پوشپەری ٢٦٩٨ی کوردی



## لەم ژمارەیەدا



بەهای (١٠) دینار

**خاوەنی ئیمتیاز**
**مەحمود کاوە حەفیدزادە**

**سەرنووسەر**
**مەلا ئەحمەدی خانەقا**

**جێگری سەرنووسەر**
**جەمال جەلال حەمەدەمین**

**سکرتێری نووسین**
**حەمە ئەحمەد جاف**

**سەرپەرشتکار**
**عەدنان حاجی کاکە**

**ناونیشان**
هەولێر - دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و
کاروباری ئیسلامی
(نووسینگەی راگەیاندن)



سەرنووسەر (٤٠٨٣) (٢٠٤٨٦)
جێگری سەرنووسەر (٤١٣٩) (٢٢٦٩٢)
سکرتێری نووسین (٤٦٧٧)
سەرپەرشتکار (٢٢٧٥١)

پیتچنین و دەرهێنانی هونەری، کۆمپیوتەری (ئەپلس)



# شاتیشکێک لە خۆری ئیسلامەوە



**مەحمود کاوە حەفید زادە - خاوەنی ئیمتیازو وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی**

لە یادی ١٢ی ربیع الاول ی ١٤١٩ی کۆچی ئەمساڵدا شاتیشکێک لە خۆری ئیسلامەوە هاوکات لەگەڵ جەژنی لە دایکبوونی حەزرەتی پێغەمبەری پێشەوای موسڵمانان {دروودی خوای لەسەر بێت} بەئاسۆی گەشی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و هەواری مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیماندا کشاو لە ئاسمانی هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستانی دایکدا هەڵهات.

ئەمەو تیشکی زێڕینی خۆری ئیسلام بە پشتیوانی خوای گەورەو هەوڵ و تەقەلای سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانو بەسەرپەرشتی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی و ژمارەیەکی بەرچاو لە نووسەرانی خەمخۆر و دڵسۆز خۆی بە کلاو ڕۆژنەی مێژووی زانست و ڕۆشنبیری ئایینی لە کوردستاندا پرژاند. یەکەم دەروازەی کاری لە ڕووی خوێنەران و موسڵماناندا والا کردەوەو بە دوای ڕێچکەی کاروانی زانستو ڕۆشنبیری ئیسلامی کەوت و لاپەڕەیەکی گەشاوەو ڕازاوەتری نەخشاند لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، سوپاس بۆ خوای میهرەبان کە لەژێر سایەی کابینەی سێیەمی حکومەتی کوردستاندا کە ئەمڕۆ لە ترۆپکی بەرزو زێڕینی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (خۆری ئیسلام) هەنگاو دەنێین بەرەو لووتکەی بەرزی ئایین پەروەری هەر لەم ڕوانگەیەوە دەڕوانینە ئاسۆی یادگارە تاڵ و شیرینەکانی پەیامی پڕ شکۆی نەتەوەکەمان لە مینبەری پیرۆزی ئیسلامەوە بۆ ڕووبەری زێڕینی مێژووی نەوەت و پێنج ساڵ یادی سەرۆکی نەتەوەییمان و ڕەمزی ئایین و ئایین پەروەری مەلا مستەفای بارزانی نەمر هەڵدەکشێین، مشتێک لە خەرواری بەرزو ئەپساوەی وەک حەقیقەتێکی زیندوو یاد دەکەینەوەو ڕێبازو ڕێنمایی و ووتە بەنرخەکانی ئەکەینە سەرمەشقی خەبات و بەرخۆدان. لە جێی خۆیدایە کە شانازی بەو ڕێبازەوە بکەین کە پتر لە نیو سەدە بێ کۆڵنەدان و ماندوو بون لە پێناوی سەرفرازی گەل و نیشتماندا دەریایەک خوێن بەخشرا بۆ بەدی هێنانی ئاوات و خەونە دێرینەکانی ئەم گەلە بەش مەینەت و ستەمدیدەیە، هەر لە دەروازەی ئەم ڕێبازەوە دەڕوانینە ئاسۆی پڕشنگداری ڕزگاری و سەرفرازی نەتەوەکەمان و بەردەوام دەبین لە خزمەت و لە هەوڵ و کۆشش تا هەموو ئەو ئاواتانەی ئەم میللەتەو ئەو پەیامە پیرۆزەی بارزانی نەمر هەڵگری بوو دێتە دی.

**خوێنەرای بەڕێز، موسڵمانانی کوردستان...**

ئەگەر لە ڕوانگەی ئایین پەروەری‌و ئیسلامیانەوە بڕوانینە بالای بەرزی ئەم زاتە گەورەیە ئەمە سەرەتایەکە و پێویستی بە چەندین لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیانەو سیمنار و کۆڕو کۆربوونەوە هەیە، چونکە مەلا مستەفای بارزانی نەمر جگە لەوەی ڕابەرێکی نەتەوەیی گەلی کوردستانەو لە تەواوی جیهاندا وەک پێناسەیەک بۆ نەتەوەی کورد کێشەی ڕەواکەی ناسراوە لە هەمان کاتدا زانایەکی هەڵکەوتوو و پایە بەرزی ئیسلام بووە و هەمیشە شوورایەکی بەهێزو کاریگەر بووە بۆ چەسپاندنی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام و پشتگیری بێ سنوور لە زانایانی ئایینی ئیسلام و هەموو کەسایەتیە ئیسلامی



یـەکانی نـاوەوە و جیهـان بەگشـتی کـردووە لـە هـەموو کاتێکدا دەروازەی بارەگا تایبەتیەکانی والا بووە لەبەردەم زەحمەتکێشـان و جـەماوەری گـەلی کـورد بەگشـتی بـە تایبەت زانایانی ئایینی کە ئەمـەش بەڵگەیـەکی حاشـا هەڵنەگرە بۆ ڕێزلێنانی ئەم ڕابەرە نەمرە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و پیاوانی ئایینی هەر بۆیە دوژمنان و ناحەزانی گەلی کورد بۆ شەهید کردنی پەنایان بردە بەر دەستەیەک لە نۆکەران و ئەڵقە لـە گوێیـان بە جل و لیباسی ئایینی-یەوە لـە پلانێکی نەخشە بۆ کێشراودا سـاڵی (١٩٧٠) بەڵام خوادی میهرەبان پاراستی و ئەو پیلانە ڕەشە پووچەڵ بووەوەو کە ئەمەش بەڵگەیەکە تەنانەت دوژمنانی کورد و کوردسـتان و مـەلا مسـتەفای بـارزانی نـەمر ئـەو حەقیقەتەیان زانیوە کە چەندە بەتەنگ ئایین و هەتا چەند ڕێزو حورمـەتی پیـاوانی ئـایینی لـەلابووە. هـەر ئـەم هەڵوێستە مێژووییانەشە هەتاکو ئێستاو هەتا هەتایە لـە دڵـی تـەواوی زانـاو ئیسـلامپەروەرانی گـەلی کـورد مەشخەڵێکی بڵێسەداری زیندووە کە بۆ تەواوی پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە ڕەسەنە جێگـەی شانازی و شـەرەفێکی یەکجار مەزنە.

بـارزانی نـەمر بیرۆکـەی یـەککگرتووی زانایـانی ئـایینی لـە کوردسـتانی عـیراقدا کـردە نـەمری واقیـع و ڕێکخراوێکی پیرۆز و سـەربەخۆ و بەهێزی لـەچوارچێوەی (یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی لە کوردستان) سـاڵی (١٩٧٠) دامـەزراندو هێنـادی کـە لـەو ڕێخـراوەدا مامۆستایانی ئایینی بتوانن لـە کێشـەکانی گـەلی کوردی موسڵمان و کێشـە ڕەواکـەی گیروگرفتـەکانی کۆمـەڵگادا بکۆڵنـەوەو پشـتگیری ڕاسـتەوخۆی جـەنابی بـارزانی نـەمر بتوانن گرفتـەکان چارەسـەر بکـەن. هـەر ئـەم هەڵوێسـتە مێژووییانە بوو لە شۆڕشی ئەیلولی مـەزندا کە زانایـانی ئایینی شان بەشانی چین و توێژو کەرتـەکانی کۆمـەڵ لـە سەنگەری بەرگری و مقاوەمەتدا بوون بۆ ڕزگاری کورد و کوردستان و ئاسوودەیی نیشتمانی دایـک. بـە حەقیقـەت ئەم قوتابخانـە پیرۆزە پـڕە لـە سـەروەری و دەسـتکەوتی سیاسی و نیشتمانی و ئایینی هەمیشە پارێزەری ڕەوشـتی پاک و داب و نەریتی ڕەسەنی کوردانە بووە و ئەم فەزڵـە و ئەرکە پیرۆزانەش بە بێگومان ئەگەڕێتەوە بۆ کەسایەتی و دیدو بۆچوونی جەنابی بارزانی نـەمر. سـوپاس بـۆ یـەزدانی تاک و تەنها هەوڵ و خەباتی ئەم میللەتە قارەمانە و ڕەنـج و مـاندووبوونی پتر لـە نیوسـەدە خـەباتی بـێ وێنـدا هاتـە بەرهەم و ئەمڕۆ تا ڕادەیەکی باش بەشێکی زۆر لە خەون و ئاواتـەکانی هاتوونەتـە دی و ڕۆڵـەکانی بـارزانی شـان بـە شانی لایەنە هاوپەیمانـەکان حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان کابینەی سێیەم دامـەزراو خزمـەتی بـێ وێنـەو بـەرچاو بـە جەماوەری خەڵکی کوردستان دەکرێت، کە ئەمـەش ویسـت و ئامانج و ئەو بەرنامانە بووە کـە سـاڵەهای سـاڵ خـەباتی بۆکـراوە هەربۆیـە ئـەمڕۆ کابینـەی سـێیەم بـە کابینـەی خزمەتگوزار ناسرا کە بـە حضـور و ئامـادەبوونی سـەرۆک بارزانی لەگەڵ دامـەزراندنی دەستبەکاربوونیدا لـە دیوانی پەرلـەمانی کوردستاندا فـەرمووی (دەبێـت ئـەم کابینەیـە کابینەی خزمـەتگوزار بێـت) ئـەوەی کـە لێـرەدا جێگـای خۆشحاڵیـە وەزارەتی ئەوقاف وەک وەزارەتێکی کاریگـەر لـە حکومـەتی هـەرێمی کوردستاندا ڕۆڵـی بـەرچاوی خـۆی دەبینـێ و بینیـوە ئیهتمـامێکی تایبـەت دەدرێـت. بـەکارو بارەکانی وەزارەت و کـە ئـەم بـە پەرۆشـیـە سـەرچاوەی لـە ئیمانی پتەوەوە و پەیڕەوی ڕێبازی بارزانی نـەمر دەگرێـت، هەر ئەوەش چاوەڕوان دەکرێت وە ئەو ڕاستیانەیە کە ئـەمڕۆ وای کردووە کە تـەواوی زانا بەڕێزەکانی ئایین پشـتگیری تەواون هەمیشە بۆ کابینەی سێیەم و بۆ وەزارەتی ئەوقاف کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەسکەوت و سـەربەزییە بۆمـان **انشـاء اللـه** ئێمـەش لـەو ئاستەدا دەبـین کـە جـەماوەری گەلو موسڵمانان بەگشتی چاوەڕوانی دەکەن هـەر لێرەشـدا جـارێکی تـر پیرۆزبـایی مـانگی مـەولوودی پـیرۆز وخۆشەویست لەسەرتاسـەری موسـڵمانانی گەلەکـەمان و عێراق وجیهانی ئیسلامی ئەکەم پەنا بـە خـوا ئـەم مانگـە موبارەکە دەبێتە خێرو خۆشی و شـادی بـۆ ئـەم گەلـە مـاف خوراوە، هـەروەها پیرۆزبـایی لـە خوێنـەران و ڕۆشـنبیران دەکـەم بـە بۆنـەی دەچوونـی گۆڤـارێکی تـر لـە نـاوەندی ڕۆژنامەگەری کوردیدا.

**والسلام علیکم و رحمة الله و برکاته**





# ((خۆری ئیسلام)) بۆ ؟!

* جێگری سەرنووسەر *

کاتێک ئایینی پیرۆزی ئیسلام پەردەی سەندو زەنگی حەقیقەتی بەگوێ ی سەرتاسەری جیهان و مرۆڤایەتی داچڕی و ڕابونێکی مەزنی دژ بە سەرتەم و زولم و چەوسانەوەو دژواری ژیان بەرپاکردو وەک قوتابخانەیەکی پاک و ڕەوان بەمەبەستی فێربوون و ئاگاهێنانەوەی مرۆڤ لە ژیانی ئاسودەو خۆشگوزەرانی و کامەرانی : ڕەنگی دایەوەو بووە فێرگەی ئیسلامی زانستەکانی قورئان وموعجیزەکان و سونەت و عیبادەت؛

هەر لەو ڕوانەگەیەشەوە (هۆشی خستە)بەر جەستەی مرۆڤ و ویژدان و مرۆڤایەتی وەئاگاهێنایەوە لەوانەش/ کۆتایی هێنان و ڕیشەکێش کردنی یاسای گەندەڵی جەنگەڵ و کۆیلایەتی کە بەر لە هەڵاتنی خۆری ئیسلام: وەک دیاردەیەکی دزێو بەری ئاسمانی گرتبوو، کەببوە پیشەی بە دەیان خەڵکی ستەم کارو زاڵم کە هەمیشە، خەڵکیان چەواشە دەکردو دەیان چەوساندنەوە، تەنانەت ئاژەڵ ئاسا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن و تێ یان دەڕوانین و وەک کالایەکی بازرگانی کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکرا؛ بەڵام لەگەڵ بانگەوازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دا کاتێک (خۆری ئیسلام) هەڵات و بە پرشنگە زێڕینەکانی سەرجەم خێوەتگای کۆیلایەتی و جەهالەتی سوتاند .. جگە لەوەش کاری نالەباری باج و سەرانە سەندن بوە پیشەی ڕۆژانەی دەسەڵاتدارانی سەردەمی پێش هەڵاتنی خۆری ئیسلام، کە

کارێکی نێگەتیفانەی کردبووە سەر کۆمەڵ و کۆمەڵ
مرۆڤایەتی، بەجۆرێک هەناسەی لە جەستەو ژیانی مر
زەحمەتکێش بڕی بوو.. ئەمەو لەگەڵ بەزربوونەوەی با
هەقی ئیسلام و جاڕدانی بانگەوازە پیرۆزەکەی ڕوخس
شەکەت و ماندووی، خەڵکی بەش مەینەت و ک
دەرامەتی بەخۆری ئیسلام گەشاندەوەو لە ڕوانگ
پێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤیشەوە؛ نرخ و پایەی
تایبەتی بۆ (ئازادی ئافرەت) داناو لەکڕین و فرۆش
ڕزگاری کردن و یەکسانی و سەربەستی بە ئافرەتان بەخ
و لە کۆیلایەتی و سوکایەتی پێ کردن ڕزگاری کر
هەربۆیەش لەو پێودانگەوە، گۆڤارەکەمان بە (خ
ئیسلام) لە ژێر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی سەرۆک مەس
بارزانی ناوزەد کراو لە لایەن کابینەی سێ هە
خزمەتگوزاری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ڕەزامە
لەسەردراو لە ڕێگای وەزارەتی ئەوقاف و کاروب
ئیسلامی هەرێمەوە کەوتە گەڕو خۆی بە جیهانی ئەمر
ڕۆژنامەو نامەخانەی کوردی ئاشناکرد، کە ئەمەش خۆی
خۆیدا ڕێزلێنانە لە ڕێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ل
ڕووەوە... نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت؛ کە شۆڕشەک
میللەتی کورد، هەر هەمویان بەسەرکردایەتی زانای
ئایینی مەشخەڵیان سەندوەو خەباتیان جۆش داوە.



ئەوەتا بۆ نموونە هەر لە سوڵتان سەلاحەدینەوە بگرە تا شێخ سەعیدو قازی و شێخ مەحمودی نەمرو شێخ عبدالسلامی بارزان و شێخ ئەحمەدو مەلا مستەفای بارزانی و مەشخەڵی شۆڕشیان گرداوەو لە خەبات سڵیان نەکردۆتەوە، بەڵێ.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گەلی کورد لە دێرزەمانەوە، متمانەو پشت ئەستور بووە بەو کەس و کەسایەتیە ئایین پەروەرانەو حگە لەمەش میللەتـ کەمان چاک لە ئایینی ئیسلام گەیشتووەو زانیو .ـی ئەو ئایینە هەمیشە پشت و پەنای زوڵم لێکراوان بووەو بەگژ ستەمکارو زۆرداروداگیرکەر داچۆتەوە.. ئەوەتا یەکێک لەو سەرکردە ئەمرانەش کە بارزانی نەمرە؛ ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاوی بینی لە دامەزراندنی (یەکێتی زانایانی ئایینی کوردستان) و پاڵپشتی لێکردنی لە هەموو بوارێکەوە؛ بێ شک ئەو زاتە نەمرە، هەردەم ڕێزی بەرچاوی لەمامۆستایان و زانایانی ئایینی دەناو مافەکانی دەپاراستن و داکۆکی لەویست و خواستەکانیان دەکرد؛ ئێستەش هەر لەو مینبەرەوە، ڕاستەوخۆو بەبەردەوامی وەک درێژەپێدەری ڕێبازی بارزانی نەمر خودی بەڕێز جەنابی سەرۆک بارزانی، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان و کابینەی سێ هەمی حکومەتی هەرێم پارێزەری ئەم ئایینە پیرۆزەن و داوایان لێ دەکات کە هەمیشە ڕێز لە ڕێبازی پیرۆزی ئایینی ئیسلام بگرن و داکۆکی لە مافەکانی مامۆستایانی و زانایانی ئایینی بکەن.....

ـ لە کۆتایی دا مەشخەڵی گۆڤاری (**خۆری ئیسلام**) لەسەرجەم میللەتەکەمان بە گشتی و ئایین پەروەرو موسڵمانانی نیشتمان پەروەری کوردستان بە تایبەتی بەرزو پیرۆزبێت..

ـ هەر بڵندو گەشاوەبێت (**خۆری ئیسلام**)ی ئیسلام...



# بەرەو




**نووسینی: هانا**

**ئەگەر ئاین پێوانەی زگماکی کارو ژیان بێت و ڕاستەوخۆ میکانیزمی ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ دەست نیشان بکات ئەوا هەر لەڕێگای ئاینەوە، بەرژەوەندییە خودییەکانی مرۆڤ دەخرێتە ئەودیو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا، لێرەدا ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بەپەیامە پیرۆزەکەی، ئامانجە بنیاتنەرەکانی لەبەدی هێنانی داخوازییە ڕەواکاندا دێنێتە کایەوە، ئیسلام بەهۆی بناغەی بیروتێڕوانینی ڕاست و دروست سەبارەت بەژیانی مرۆڤایەتی، مرۆڤ ئامادە دەکات بۆ جیهانێك کەنەماندو بوونی تێدایەو نەکلۆڵی و کوێرەوەری، لەهەموو هەنگاو قۆناغەکانیدا پێوانەیەکی نوێی ڕەوشتی بۆ تەرخان کردووە، کەبریتی‌یە لەڕەزامەندی خوای گەورە، کەواتە ڕێگا نادرێت بەهەر شتێك کەبەرژەوەندی کەسایەتی لەبەرچاوی بگرێت، خۆ ئەگەر هەر زیانێك بێتە ئاراوە، ئەوا حەرام و نالەبارە. ئەو پێوانە ڕەوشتییەی هەموو کردەوەکانی مرۆڤی پێ دەپێورێت، ئەو ئەندازەو ڕادەیەیە کەمرۆڤ بەدەستی دەهێنێت ئەو ئامانجە پیرۆزە، مرۆڤی ڕاست و دروست ئەو مرۆڤەیە کەئەو ئامانجە جێبەجێ دەکات، شەخسیەتی ئیسلامی تەواویش، ئەو شەخسیەتەیە کەبتوانێت لەهەموو قۆناغەکانیدا، بەپێی ئەو ئامانجەو لەسەر تیشکی ئەو پێوانەیە، لەچوارچێوەی گشتی ئامانجەکەدا بروات بەڕێوە.**

**تێگەیشتنەکانی ئاینی ئیسلام بۆ ژیان و لێکدانەوەی ئەوژیانە، مەسەلەی کۆمەڵگا، مەسەلەی تاکە کەسیشە، ناتوانرێت ئەو شێوەیە لەگونجاندن بێتەدی، لەسێبەری تێگەیشتنی ماتریالیزمانەدا بۆ ژیان، چونکە تێگەیشتنی ماتریالیزمانە بۆ ژیانی وا لەمرۆڤ دەکات کەتەنیا بڕوانێتە گۆڕەپانی ئێستای ژیانی سنوور بۆ دانراوی، بەپێچەوانەی لێکدانەوەی واقیعی‌یە بۆ ژیان کەئیسلام پێشکەش دەکات، چونکە ئەمە گۆڕەپانەکەی مرۆڤ فراوانتر دەکاتەوەو تێڕوانینێکی قوڵتری بەسەر دادەسەپێنێت، بۆ ڕوانین لەبەرژەوەندی‌یەکان و سوودەکانی، هەروەها ژیانی‌نزیك دەکاتە قازانجێکی ڕاستەقینە بەپێی ئەو تێڕوانینە قووڵە، هەروا قازانجە نزیکەکانیش دەکات بەزیانێکی ڕاستەقینە لەدواییدا هەروەك یەزدانی مەزن دەفەرموێت (من عمل صالحا فلنفسە ومن اساو فعلها).**



# بەیاننامەیەك لەوەزارەتی ئەوقافو كاروباری ئیسلامی هەرێمی كوردستانەوە، بەبۆنەی لەدایكبوونی پێغەمبەری پێشەوامان محمد (د.خ)

بسم الله الرحمن الرحیم

**لقد كان لكم فی رسول ا للّه اسوة حسنة لمن كان یرجوا اللّه والیوم الاخر وذكر اللّه كثیرا**

**صدق الله العظیم**

یادكردنەوەی رۆژی پیرۆزو پرشكۆی ١٢ی رەبیعولئەول بەرانبەرە ٦ تەمووزی ١٩٩٨ی زاینی سالّیادی لەدایك بوونی پێغەمبەری سەروەرو رابەری ئیسلامو پێشەوای موسلمانان حەزرەتی (محەمەد) سەلامی خوای لیّ بێت. خۆی لە خۆیدا یادی جەژنێكی گەورەی سەرجەم موسلمانانە كە تیایا چراو مەشخەلّی ئیسلام لەلوتكەی سەروەری مرۆڤایەتیو سۆزو ویژدانو هەلّویستی بەرزو خورەوشتو ئەمەكو قوربانی دانەوە، هەلكراوە، شەوەزەنگی جەهالەتو كۆیلایەتی رووناك كردەوە، ئاشكرایە بەلەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلامو مرۆڤایەتی، مەشخەلێكی تر بەسەر جیهاندا خۆی پەخش كردو سەرتاپای گێتی رۆشن كردەوەو لەسەر هەموو دوندو نشێوی جەهالەتدا، بەیداخی ئیسلام شەكایەوەو بانگەوازی حەقیقەتو دادپەروەری بە گوێچكەی جیهاندا هەلّداو تاوانو كۆیلەو ژێر دەستەو كۆیلایەتیو قەلاّچۆكردو، لەسەردەمی پرنووری حەزرەتی محەمەد (د.خ) ئاینی پیرۆزی ئیسلام كاروانی سەروەرانی خستە گەرو سەرجەم گێتی لە جەهالەتو نەزانینو نەفامیو كۆیلایەتی رزگار كردو دادپەروەری بلاّوكردەوە، ئەو پێغەمبەرەی سەرجەم ژیانی هەلّوێستو رەوشت بلّندیو نموونەی بەخشندەییو وەفاو ئازایەتیو ئەمەك بوو، هەر وەكو لە فەرموودەیەكیدا دەفەرموێت (انما بعثت لأتمم مكارم الاخلاق) واتە (نێردراوم رەوشتە بەرزەكان تەواو بكەم) بۆیە لێرەدا جێگای خۆیەتی یادی بكەینەوەو گەورەترین ئاهەنگی بۆ بگێرین، هەلّبەت ئەمسالّ ئێمەش وەك وەزرەتی ئەوقافو كاروباری ئیسلامی هەرێمی كوردستان لە ژێر رێنماییو راسپاردەكانی جەنابی سەرۆك بارانیو بەهاوكاری سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیرانو بە ئامادەبوونی سەرجەم وەزیرانو دەزگا ئیداریەكانی كابینەی سێیەمی حكومەتی هەرێمی كوردستان، بەپێی بەرنامەیەكی دارێژراو (كەوەزارەتەكەمان پێی هەلّدەستێت) سەرقالّی خۆسازدانو خۆ ئامادەكردنین بەمەبەستی پێشوازی كردن لەم جەژنە پیرۆزەو مەزنی ئەم یادە پڕ شكۆیەی موسلّمانان، دیارە بۆ ئەم بۆنەیەش ئاهەنگ دەگێرینو بۆ ئەم مەبەستەش بەرنامەیەكمان دارشتووە كەلە (٨) مزگەوتی پایتەختی هەرێمدا ئاهەنگی گەورەی ئاینی سازبدەین، گومانی تێدا نییە كە كەسایەتیو خۆشەویستی پێغەمبەری ئیسلام لەوە گەورەترە كە بەسازدانی چەند ئاهەنگێك ئەم جەژنە مەزنە یاد بكەینەوە بەلّكو تەنها دەربڕینی سۆزێكە بەرامبەر گەورەیی ئەو زاتە موبارەكەو نرخاندنی كەسایەتیو خورەوشتی بەرزو ئاكارەكانیو هیچی تر... ئەگینا رێزو حورمەت گرتن لەو رۆژە بەسە بۆ بەهەند هەلگرتنی كەسایەتیو خۆشەویستی ئەو زاتە، بۆ ئەم مەبەستەش حكومەتی هەرێمی كوردستان لە ژێر رۆشناییو رێنمایی خودی بەرێز سەرۆك بارزانی رۆلّێكی گەورەو شكۆداری بەم یادەورەیە پیرۆزە، داوەو دەداتو بۆیە داوا لەسەرجەم موسلّمانانی كوردستان دەكەین، بەشداری لەئاهەنگی یادكردنەوەی ئەم رۆژە پیرۆزەدا بكەن و زۆر بەگەرمی و دلّگوشادییەوە پێشوازی لیّ بكەن، بیّ شك هاوكاریو ئامادەبوونتان لەم یادە رێز گرتنە لەم رۆژە پیرۆزەو لەهەمان كاتدا دەربڕی سۆزێكی خۆشەویستی مەزنە.. بۆیە لەكۆتاییدا بەناوی وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی هەرێمی كوردستانەوە بەدلّێكی پڕ شەوقەوە دەروانینە ئەم رۆژە پیرۆزو پڕ شكۆیەو لەلای خۆشمانەوە گەرمترین و جوانترین چەپكە گولّی پیرۆزبایی بەم بۆنە پێشكەش بە خۆمان و تێكڕای موسلّمانانی كوردستان و عیراق و جیهانی ئیسلامی دەكەین و ئومێد دەكەین ئەم جەژنەش ببێتە مایەی هاتنە ئارای خێرو خۆشیو گەڕانەوەی ئاشتیو متمانەو دلّنیایی و ئارامی بۆ هەرێمی موسلّمانی كوردستانی خۆشەویستمان.

**وەزارەتی ئەوقاف و كاروباری ئیسلامی**
**١٩٩٨/٧/٤ زاینی**
**١٠/ رەبیعوئەوەل/ ١٤١٩ كۆچی**



بسم الله الرحمن الرحيم

((قُلْ كُلٌ يَعْمَلُ على شاكِلَتِهِ، فَرَبُّكُمْ أعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أهدى سبيلاً))

صدق الله العظيم

# خۆری ئیسلام و چمکێ لە ئەرکی سەرشانی موسڵمانی کورد



شێخ محسن مفتی
سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان

**خوێنەری بەڕێز:**

**هەر کەسێ لەم ژیانەدا، کە فیکرەیەک بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ، ئەبێ لێی دڵنیا، بێ ئەبێ باوەڕ و متمانەی لەسەری هەبێ، ئەگینا دوای ماوەیەک بایەخی لای نامێنێ و، لە جیاتی ئەوەی فیکرەکە لەمەوە قازانج بکات. ئەم ئەبێ بەبار بەسەریەوە، لەم جیهانەدا ڕێبازو بۆچونی زۆر هەن، کە خەڵکی لەسەری ئەڕۆن و پابەندی لێ بکەن. لە ساڵانی ڕابردوودا دونیا بەخێرایی گۆڕانی بەسەردا ئەهات هەر وڵات و میللەتێ بە شێوەیەکی جیاواز تەعبیریان لەو گۆڕانکاری‌یە ئەدایەوە، ئەفرادی میللەتان چونکە بە ئازادی هەمو بۆچونەکانیان هەڵئەسەنگاند، متمانەیان بە شێوەیەکی تر بۆ پەیدا ئەبوو. کە هەندێ لە فیکرەکان مرۆڤ ڕسوا ئەکەن. هەندێکیشیان ئەتگەیێننە چڵە پۆپەی ژیان و دەسکەوتی مادی، بەڵام ناتوانن ئاسودەیی و ئارامیت پێ ببەخشن ... هەندێ ڕێبازیش دین و دونیات لە کیس ئەدات. تەنها یەکێ لەو پەیرەوانە بەختیاری ژیانت بۆ مسۆگەر ئەکات و، لە دوودڵی و ڕاڕایی و فیتنەیی و شەڕەنگێزی ڕزگارت ئەکات، سەربەرزی ژیان و ڕوسوری دیوانی بەروەردگارت ئەکات کە شوێن کەوتنتە بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام.**

فیکرەی ڕاست دۆستی کەمەو دوژمنی زۆر...! ئیرادەی دۆستەکانی بەهێزەو هێزی دژایەتی ناحەزو نەیارانی لاوازە. شوێن کەوتوانی ڕاستەقینەی ئیسلام یارمەتی دەرانی مادییان کەمەو، پشتەو سوربان بە هێزی مەعنەوی خوایی زۆرە، دەوڵەتی دڵ و دەورونیان ئاوەدانەوەو ئیمانیان پتەوو بەهێزە، قەڵای سەختی شەیتان و دوژمنانیان چەندێ بۆ خەڵکی توندو تۆکمەبێ لە ئاستی بڕواداری ڕاستەقینەدا، وەک شیوو سەرەو لێژگەی هەزار بە هەزار، ساراو بێ بایەخ و پوچەڵ ئەمێنێتەوە....

گەورەیی ئیسلام لەوەدایە کە ئەوەی بە درۆ خۆی پیا هەڵواسیبێ وەری ناگرێ و لێی ئەبێتەوەو، بۆ یارو نەیار ئاشکرا ئەبێ، ئەوەی پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبێ خێری بۆ ئەداتەوە ئەوەی بە دەمیەوە بڕوا سەرفرازی ئەکات، ئەوەی بە دڵسۆزی ڕاست کات لە گەڵیا سەربەرزو شکۆداری دونیا و پاشەڕۆژی ئەکات.

گەورەیی ئیسلام لەوەدایە، ئەوەش کە بە تەسکەرە موسڵمانە، پیێ بڵێی کافر، زۆر نیگەران ئەبێ و ڕەنگە قبوڵیشی نەکات...! بەڵام فیکرەی مادە پەرستەکان ئەگەر ڕاستەوخۆ کافریش بن و بەو ناوەوە



بانگیان لێ بکەیت، پێیان ناخۆشەو رویان نایە، ناو دەروونی خۆیان بۆ هەموو کەس ئاشکرا بکەن.

یان زۆر جار ئەو بەرنامەی ئەو بە بایەخەوە هەوڵی بلاوکردنەوەی ئەدات و ، خۆی ئەکات بە خاوەنی، رەنگە رازی نەبێ بەسەر خۆیدا جێ بەجێ بکرێ... بە نمونە گەنجێکی بەرەلاییخواز بهێنی، کە حەز بە ناو ئازادی بێ قەیدو شەرتی ئافرەتان بکات، ئەو ئافرەتەی کە خۆی تاریفی ئەکات ، بەرەوی پێ ئەدات بەو شێوە ناجۆرە رای ئەهێنێ، بەدوی هەواو ئارەزواتی نەفسی ویلێ و سەرگەردانی ئەکات هانی ئەدات لەسەر پابەندی نەبون بە ژیانی ئاسودەیی خێزانی و، رێزو پیرۆزی نێوان ژن و پیاو.... ئەگەر بێت و ئەو ئافرەتە نمونەیی‌یە بیکەیت بە هاوسەری خۆی، هەرگیز پێی رازی نابێ... حەز ئەدات ژیانی خەڵکی تێک بدات، بەلام خۆیشی چاک دڵنیایە، کە ئەو جۆرە تایبەتی‌یە کەڵکی ئارامی و هاوبروایی و، متمانەو ژن و مێردی نی‌یە؟! بۆیە ئەگەرێ بەدوای کەسێک کە جێگای سەرنج و نیشانەی پرسیاری لەسەر نەبێ...! کەواتە تەنها فیکرەو رێبازی راستە، کە شانازی پێوە بکەیت، روت هەبێ باسی بکەیت لە ژێر پەردەی نهێنی و رێکخستن و چپەچپەوە نەیشاریتەوە....ئەگەر شیاوی بلاوکردنەوەیە، بە ئاشکرا خۆت بکەیت بە خاوەنی، نەک راراو دودڵ بی لەسەری ....

ئێمە دڵنیاین کە هەموو موسڵمانێ، بەتەواوی ئارەزوی خۆی ئیسلامی هەڵبژاردووەو ، بەزۆر نەسەپێنراوە بەسەریدا، وە ئەوەندەش دەستەلاتی دونیایی نەبووە تا بە زەبری بالا دەستی، خەڵکی راپێچ بکات و فیکرەی خۆی فەرز بکاتە مێشکیانەوە.... هەروەها ئیسلامیش خۆی قابل نی‌یە، کە کەس بە زۆر بکرێ بە موسڵمان[ **لا إكراه في الدين، قد تبين الرشد من الغى**] خۆ ئەگەر منداڵیش لەسەر **فیطرە**تی ئیمان لەدایک ببێ و ، لەناو کەشێکی پر لە بروا پەروەردە ببێ، دوای گەورە بونی ئارەزو لە دەستی خۆیدایە، هەرچەندە ئەوەندە هۆکاری لادان لە ئاین و دینداری لە ئارادایە. ئەگەر کەسانێ بە راستی بمێننەوە ، جێگای سەرسورمانەو، نیشانەی بە هێزی موعجیزەی ئیسلامە. کەواتە موسڵمان بوون کارێکی بە نرخ و پیرۆزە، ئیسلامیش رێبازێکی تەواو پر بەهایە، جێگای خۆیەتی کە میللەتی کوردمان ، شانازی بە ئیسلامەوە بکات، مەشخەڵی هەڵگراوی بێ، ئامانجی سەرەکی و سەرانسەری بێت، کوردستانی نازیزمان برازێنینەوە بە دروشمەکانی ئیسلام، بە وتە پیرۆزەکانی، کۆمەڵگای کوردەواریمان، دەوڵەمەند بکەین بە زیاتر گەرانەوە بۆ ژێر سایەی بیرو فیکرەو نەریت و پەیرەوی ئیسلامی مێشکی گەنجەکانمان، تێراو بکەین بە ئیسلامی راستی، دڵیان دەوڵەمەند بکەینن بە متمانەو یەقین، بە دڵسۆزی ئاینەکەیان. چاویان فێتک بکەینەوە ، بە شوێن کەوتن و جێ بە جێ کردنیان ، بۆ فرمانە پیرۆزەکانی راست و چەوتیان بۆ جیا بکەینەوە، تاریفی موسڵمانی راستەقینە یان بۆ بکەین و لە هەڵدێری بیرو فیکرە رزیوەکان لایان دەین و، لە شومی ئەوانەش بیانپارێزین، کە ئیسلامیان کردووە بە دوکانی بازرگانی و هۆکاری گەیشتن بە هەندێ بەرژەوەندی تایبەتی و لاوەکی!!

بە پێویستی ئەزانین ، [خۆری ئیسلام] لە روانگەی رێبازی حەزرەتی پێغەمبەر و **صەحابە** بەرزەکان و پێشەوا (مجتهد)ەکان و خواناسە راستەکانەوە، خزمەتی خۆی راگەیێنێ و بە دڵسۆزی دەست بەکار بێ و ، هەوڵێکی لەبار و بەتین و گور بدرێ، بۆ یەکخستنی دەنگ و قەڵەمە دڵسۆزو نەگۆرو نەدۆرەکان بۆ ئەوەی هەوڵی ئیسلامەکان، لە پێناو ئیسلام دابێ، نەک لە پێناوی بەرژەوەندی خاوەن ئامانجەکان

سوپاس بۆ خودا، ئیسلامی راستەقینە، سەدان ساڵە لە کوردستاندا بلاوبووەتەوە بە هیمەتی زاناو خواناس و دڵسۆزان، مینبەرو میحراب و حوجرە و تەکیەو خانقا پیرۆزەکان، خۆری ئیسلام هەرگیز لە کوردستان ئاوا نەبووە.

ئەوەی خزمەتی ئیسلامی کردووە، بۆ کورسی و **منصەب** و خۆ دەوڵەمەند کردن نەبوو هەرگیز وشەی داهاتوو (مستقبل) یان بە بیردا نەهاتووە، موچەو یارمەتی و دەسکەوتی دونیایا نەکردووە بە ئامانجی موسڵمان بونیان، موسڵمانی کورد، لە خزمەت ئیسلامدا بووە بە پلەی یەکەم، کۆمەڵگایەکی ئیسلامیان دروست کردووە، کە گەورەو گەدا، زانا و نەزان، بێ دەست و بالا دەست هەموو شەرع و حوکم و چارەسەری کێشەکانیان و لە مزگەوت و مەڵبەندە ئیسلامی‌یەکان براندۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو پەری دڵسۆز بوون بۆ وولاتی خۆیان، بۆ میللەتی خۆیان، لەشەوە زەنگی نەزانین و تاریکی



رزگاریان کردوون، دیان و سەدان شۆڕشی گەورەیان لە پێناو رزگاری و بەرگری لە مافەکانیان، بۆ هەڵگیرساندوون و خۆیان لە پێشەنی قافڵەی موجاهیدانەوە بوون.

کەواتە ئێمەی کورد موسڵمانین، وە شەرەزاین لە ئیسلام، و خوازیاری ئەوەین، ئەو هەستە ئیسلامیەیە ئێمە پابەندی لێ ئەکەین، کە پریەتی لە چاوپۆشی و خۆشەویستی و ، دوری لە رەگەزو نەژاد پەرستی، خوازیارین کە برا موسڵمانەکانی تریشمان فێر بکەین، لە میللەت و نەتەوەکانی تر....! بەڵام هەرگیز پێویستمان بە ئیستیرادی فیکرە دزێوەکانی ئەوان نی یە، کە بۆ خۆیان دورن لە ئیسلامەتی راستەقینە، هەرگیز ناوێرن، وشەیەک بەرامبەر زاڵم و دەستەڵاتدارەکانیان باس بکەن ، وە ئێستاش دان نانێن بەوەدا، کە گەلێکی چەوساوەی وەک کورد، خاوەنی مافی رەوا خۆیەتی.... بەلاَ لەسەر حیسابی کیان و قەوارەی بون و مافی ئێمە، قسەی قەڵەوو پرۆژەی تایبەتی پیادە ئەکەن، کە زیاتر تەعبیرە لە بۆچوون و بەرنامەی ولاتانی دژ بە کورد، ئێمە لە کوردستاندا، کەمو کوریمان زۆرە، بەڵام خۆزگە قەڵەمەکان نەکراوبونایەو، بەگیانی بونیات نان و دڵسۆزی پەنجەی هێمایان بۆ رابکێشانایە، نەک بە مەبەستی کافرکردن و لە دین دەرکردن.

رەواییە کە بە گیانی خۆنەویستی و دور لە هەڵەشەیی سەرنج لە تێکرایی رووداوەکان بەین و ئەو پێوەر پێوانەی، کە دەستەڵاتدارە کوردەکانی پێ ئەخەینە بەر مەودای تیر و توانج و هێرش ، هەر بەو چاوەیشەوە لەو روانگەیەشەوە سەیری دەوڵەتە دەوڵەمەندە خاوەن کیان و دراوەکان بکردایە.... کە زۆر هەن بە ناو ئیسلامەوە قسە ئەکەن، بەڵام لە گوڵی کاڵتر بەوانە ناڵێن و، باسی هەڵەو تاوانەکانیان ناکەن، یان زۆر بە داخەوە، هەیە بەراورد لە میانی عەرەب و فارس و تورکەکاندا ئەدات دەستەڵاتدارانی ئەو میللەتەی، کە دەیان هەزار ئەصحابی پێغەمبەریان (**صلى الله عليه وسلم**) بەلاوە (مرتد)ەو، لە ۹۹٪ ی فەرموودەکانی حەرزەتی پێغەمبەریان بەلاوە بێ رەواج و نادروستە، بە شان و باڵی ئەواندا ئەڵێن، چونکە حیساب بۆ ئیسلام ناکەن کە خوا لە پاشەرۆژدا رایان ئەگرێ و، بە پێوەری ئایەتی (**ما يلفظ من قولي الا لديه رقيب عتيد**) موحاسەبەیان ئەکات لەو کاتە ترسناکە ناترسن، بەڵام بیر لە داهاتوی کەمی دونیا ئەکەنەوەن کە رێگای تەراتێن و دانیشتن و هاوکاری و هاورازی و هاو ئامانجیان لێ نەگیرێ!! بەو هیوایەی، کە دەنگی [خۆری ئیسلام] و، هەموو دەنگە دڵسۆزەکانی زانایان و دڵسۆزانی ئیسلام، لە هەرێمی کوردستان، بە روانگەی فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر بجوڵێتەوەو، ئامۆژگاری بکەن کە ئەفەرموێ: **((إن الدين النصيحة، قلنا لمن يا رسول الله، قال لله ولكتابه وارسوله، ولائمة المسلمين وعامتهم)) رواه مسلم والنسائي**....

با ئامۆژگاری، بۆ تەواو کردن بێ نەک بۆ روخاندن، بۆ دڵسۆزی و نیەتی رەزامەندی خوابێ، نەک بۆ مەبەست و مەرامی تایبەتی و، جێبەجێ کردنی نەخشەی ولاتە خاوەن ئامانجەکان.

باهەوڵ و خەبات و دڵسۆزیمان پێکەوە بێ نەک جیاجیا، یەک ئامانج یەکمان بخات، نەک دەیان تولە رێگا لەیەک دورمان بخاتەوە، موسڵمانێکی راستی شوێن کەوتوی ئیسلام و رێبازی ئەهلی سونەت و جەماعەت بین و لێی لانەدەین... دڵسۆزی ولات و ئەزرو ئاوو خاکەکەمان بین، تا کاروانی خەباتی کورد ، بگاتە دوا قۆناغی رزگاری و ، کەشتی سەرفرازی لەناو گێژاو و شەپۆلی دەریاو سەدان و هەزاران پیلانی دوژمن و ناحەزانی کورد و ئیسلام رزگارمان بێ، ماوەیەکیش لە ژێر سایەی خۆری پرشنگ داری ئیسلام دا، خۆمان و میللەت و کیان و سەربەستیمان پارێزراو و حەواوە بین، ئەو کاتە بە راستی موسڵمانین و لە بەرنامەی ئیسلام تێگەیشتووین،

ئەگەر بە ناوی ئیسلام و ئیسلامەتییەوە، چاکەو باشەی ئێمە لەم بن دەستەدا، بە خۆمان و نەتەوەکەمان نەگات، چۆن بروا بکەین یان بەتەما بین، یەکێ بۆ خۆی بێ چاو بێ و، رێپیشاندەری خەڵکی بێ....! راستە کاری هەموو کەس لەسەر ئەو شێوەیە، کە پێی راهاتووەو، بە پێی رێبازو پەیرەوو سروشت و لایەنی لەسەر پەروەردە کراوی ئەجوڵێتەوە، خوایش ئەزانێ کێ لە هەمووان راستترە، لەسەر رێبازی رێنومایی کراوی پەسەندی خوایی ژیان بەسەر ئەبات...



# هەواڵەکانی وەزارەت

## وەزیری ئەوقاف ئەزموونە گشتییەکانی خوێندنی ئیسلامی بەسەر کردەوە

* ڕۆژی ٢٠ / ٦/ ١٩٩٨ بەڕێز شێخ مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بە یاوەری بەڕێزان مامۆستا مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەت و بەڕێوەبەری گشتیی دیوانی وەزارەت، بە مەبەستی دەست پێکردنی ئەزموونە گشتییەکانی هەردوو قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی خوێندنی ئیسلامی سەردانی هۆڵەکانی تاقیکردنەوەکانیان لە شاری هەولێر کردو لە نزیکەوە لە چۆنیەتی بەڕێوە چوونی کاروبارەکانی ئەزموونەکانیان کۆڵیەوە. شیاوی باسە ئەزموونەکانی قوتابخانەکانی ئایینی بۆ خوێندنی ئیسلامی لە سەرانسەری پارێزگاکانی کوردستان بە یەکگرتوویی بەڕێوە دەچێ. کە ئەمەش زەمینەیەکی ڕێخۆشکەرە بۆ جێبەجێ کردنی هەنگاوەکانی ئاشتی لە هەرێمی کوردستاندا، هاوکات ڕۆژی دواتر قۆناغی ئامادەیی دەست بە ئەزمونە گشتییەکان دەکات، ئەمەو بەڕێزیان پشتگیریان بۆ سەرکەوتنی ئەزموونەکان دەربڕی هیوای سەرکەوتنیان بۆ قوتابیان خواست.

## وەزیری ئەوقاف بە نوێنەرایەتی سەرۆکی حکومەتی هەرێم سەرۆکی پێشوی یەکێتی زانایانی ئایینی بەسەر کردەوە



* ئێوارەی ڕۆژی ١٩٩٨/٦/٢٢ بەڕێز (مەحمود کاوە حەفید) وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بە نوێنەرایەتی بەڕێز سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان سەردانی مزگەوتی شێخی چۆلی لە پایتەختی هەرێم کردو مامۆستا مەلا (عەلی عەبدوڵڵا حەمەدەمین)ی زاناو کەسایەتی ئایینی شاری هەولێر و سەرۆکی پێشووی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان بەسەر کردەوە، بە ناوی سەرۆکی حکومەتەوە لە تەندروستی و گوزەرانی مامۆستای پرسیار کردو سوپاسی بەڕێزیانی پێ ڕاگەیاند کە مامۆستا خزمەتی ئایینی ئیسلام و نەتەوەکەی بۆ ماوەیەکی درێژ کردووەو بەردەوامە، پاشان بەڕێزیان لەکارو پێداویستی مزگەوتەکەی کۆڵیەوەو ڕۆڵی مامۆستایانی لەبەرەو پێش بردنی ئایین نرخاند، ئینجا مامۆستای ناوبراو سوپاسی بەڕێز سەرۆکی حکومەت و وەزارەتی ئەوقافی کرد کە بەڕێزەوە گرنگی بە بوارە ئایینییەکان دەدەن. ئەمە و بەڕێز بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێر لەو سەردانەدا یاوەری بەڕێزیان بوون.

## (١٠) هەزار دانە قورئانی پیرۆز بۆ مزگەوتەکانی کوردستان دابین کرا

بێ گومان کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان هاوکات لەگەڵ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان و سەقامگیرکردنی ئاشتی و ئاسایش و پەرەپێدانی ژیانی هاوولاتیان چەندین پرۆژەی خزمەتگوزاری ئەنجام داوە. جگە لەوانەش گرنگی زۆری بە دروست کردن و چاک کردنەوەی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکان لە هەرێم داوە، دوای ئەوەی لە لایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی‌یەوە پرۆژەی زیاتر پێشکەش بە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەکرێت و رەزامەندی بۆ وەردەگیرێت، بۆ ئەم مەبەستە بەرێز (مەحمود کاوە حەفید) وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی لە لێدوانێکی تایبەت بۆ (**گۆڤاری خۆری ئیسلام**) رایگەیاند: ((دوای ئەوەی رەزامەندی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران وەرگیرا بۆ دابین کردنی (١٠,٠٠٠) هەزار دانە لە قورئانی پیرۆز بۆ سەرجەم مزگەوتەکانی هەرێمی کوردستان لە پارێزگاکان و شارۆچکە و دێهاتەکاندا کەوا وەکو پێویستی‌یەکی رۆژانەی گرنگ بۆ سوود وەرگرتن و زیاتر رۆشنبیر کردن و بلاوکردنەوەی پەیامی ئایینی ئیسلامی پیرۆز لە کوردستان دا بە پێی ئایەتە پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەرمان (د.خ).)).

ئەمەو بەرێزیان سوپاسی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و کابینەی سێهەمی حکومەتی هەرێمی کوردستانی کرد کە هەمیشە بە تەنگ داواکاری‌یەکانی وەزارەتەکەمانن لە پێناوی گەشە و پاراستنی ئایینی ئیسلام.. ئەمەو بەرێز وەزیری ئەوقاف لە لێدوانەکەیدا ئاماژەی بەم گرنگی پێدان و چاودێری حکومەت کردوو وتی:. ((جێگای شانازیە بۆ کابینەی سێیەم کە لە مێژووی دەست بەکار بوونیدا چەندەها کاری خزمەتگوزاری پێشکەش بەگەل و ئایین و نیشتمان کردووە، بەبریاردان بۆ ئەم کارە پڕ بەهایە شانازی‌یەکی تری تۆمار کرد)).

بەچاودێری بەرێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

### لەچەند ئاهەنگێکدا

## جەژنی مەولودی پێغەمبەری پێشەوامان (د.خ) لەپایتەختی هەرێم .. یاد کرایەوە

لەبەر رۆشنایی رێنمایی‌و راسپاردەکانی بەرێز سەرۆک بارزانی‌و بەچاودێری بەرێز د.رۆژ نوری شاوەیس) سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران‌و بەسەرپەرشتی بەرێز شێخ مەحمود کاوە حەفید زادە وەزیری ئەوقاف‌و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان. کاتژمێر (٩)ی سەر لەبەیانی رۆژی ٦ی تەمووزی ١٩٩٨ز بەرانبەر ١٢ی رەبیعل ئەوەلی ١٤١٩ك بەبۆنەی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری موسلمانان حەزرەتی (محەمەد) سەلامی خوای لێ بێت.

وەزارەتی ئەوقاف‌و کاروباری ئیسلامی لە مزگەوتی حاجی قەرۆك (محەمەدیە) لەپایتەختی هەرێم ئاهەنگێکی گەورەو قەشەنگی ئایینی سازدا.

ئەمەو ئاهەنگەکە کە بەرێزان فەلەکەدین کاکەیی وەزیری رۆشنبیری‌و فەرەنسۆ هەریری وەزیری هەرێم‌و پارێزگاری هەولێرو سەعد عەبدوللا بەرپرسی لقی (٢)و نیزامەدین گلی بەرپرسی لقی (١٢)ی پارتی





دیموکراتی کوردستانو ماموستا مەلا ئەحمەدی خانەقا بریکاری وەزارەتی ئەوقافو شێخ ئەڵلا ئیبراهیم بریکاری وەزارەتی کشتوکاڵو شێخ موحسین موفتی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستانو ماموستا سەلاحەدین ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانو هادی عەلی ئەندامی (م.س)ی یەکگرتووی ئیسلامیو غەفور مەخموری سکرتێری یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستانو شوان کوڤلی سەرۆکی دەزگای شەهیدو مەهدی خۆشناو جێگری پارێزگاری هەولێرو ژمارەیەکی بەرچاو لەکەسایەتیو ماموستایانو زانایانی ئایینی شاری هەولێرو دەوروبەریو کۆمەڵێك لەبەر پرسانی حکومیو حزبیو لایەنە سیاسیو ئیسلامییەکانو جەماوەرێکی زۆری ئاین پەروەری پایتەخت ئامادەبوون.

سەرەتا ئاهەنگی مەولودی پێغەمبەر (د.خ) بەخوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز لەلایەن ماموستا مەلا جەرجیس ئیبراهیم دەستی پێکرد، پاشان بەرێز مەحمود کاوە حەفید وەزیری ئەوقافو کاروباری ئیسلامی وتاری لیژنەی باڵای ئاهەنگەکانی مەولودی خوێندەوەو ئاماژەی بەگەورەییو پیرۆزی ئەم رۆژە زێرینەی جەژنی مەولود کردو تیشکی خستە سەر رۆڵی بەرچاوی پێغەمبەری ئیسلام لەرزگارکردنی مرۆڤایەتی،

ئینجا بەرێز د.رۆژ نوری شاوەیس سەرۆکی حکومەتی کوردستان وتارێکی گرنگی سەبارەت بەو یادە پیرۆزە پێشکەش بە ئامادەبووان کردو تیایدا وێرای پیرۆزبایی لە موسڵمانانی کوردستانو جیهانی ئیسلامی تیشکی خستە سەر چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بە دڵسۆزیمان بۆ ئایینی ئیسلامو نەتەوایەتی گوتی: (ئەبێت ئێمە لەبەینی یەکتردا، رەحمان هەبێتو بەرامبەر دوژمنانیشمان یەك بین) پاشان رۆڵی هێژا سەرۆك بارزانی خستە روو، سەبارەت بەهەوڵو دەست پێشخەرییەکانی بەرێزیان بۆ ئاشتیو ئاسودەکیو ژیانی خەڵکی خۆراگرو موسڵمانی کوردستان، هەروەها گوتی با ئەم رۆژە پیرۆزە بکەینە رۆژی چەسپاندنی ئاشتیو یەکگرتنەوەی هەرێمی کوردستانو بنبڕ کردنی شەڕی ناوخۆ.

دواتر بەرێز شێخ موحسین موفتی ئەندامی پەرلەمانو سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان وتارێکی پێشکەش کردو تیایدا وێرای پیرۆزبایی لەسەرجەم موسڵمانانی کوردو جیهان تیشکی خستە سەر رۆڵی ماموستایانو زانایانی ئایینی لە خزمەت کردنی رێبازی ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا.. پاشان ئاهەنگەکە بەردەوام بوو لە پێشکەش کردنی وتاری ئایینی لەسەر پێغەمبەرو سروودی ئایینی کەلە لایەن تیپی فەقێیانی ناوەندی ئەوقافی ئیسلامی پێشکەش کراو



جەماوەری شاری هەولێر دەرژانە نێو ئەم مزگەوتانەی ئاهەنگیان لێ سازدرا بوو.





# پیرۆز بێت یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری موسڵمانان محەمەد (د.خ)

زهیر كوردۆ رەشید

ڕوناكیت ئەی پێغەمبەری خوا، رەحمەت و بەرەكەتت ئەی ...ەری پێشەوا هەموو دونیاو بونەوەری گرتەوە. ئەم پێغەمبەرە خۆشەویست و نازدارە ((**كان بين الناس مؤمنا وبين المؤمنين رجلا وبين الرجال بـ لا وبين الابطال قدوة و مثلا. ذلكم هو محمد بن عبد الله ... كالشمس في ضحاها وكالقمر اذا تلاها وكالنهار اذا جلاها**)).

بەڵێ لە دایك بونی پێ...ەری پێشەوا، ڕوناكی و خێرو...ی و بەرەكەت بوو ڕەحمەت بوو بۆ هەموو دروست كراوی خوای گەورە. ڕەحمەت بوو بۆ مرۆڤ بۆ ئەجنە بۆ دار و درەخت بۆ ئاژەڵان بۆ زەوی بۆ ئاسمان ئەم ڕەحمەت و بەرەكەتەش لە مانگی بەهاری یەكەم دا هاتۆتە دونیا. هەرچەندە (زانایان) جیاوازی زۆریان هەیە لەسەر (كات و ساڵ و مانگ و ڕۆژو جێگای)) لە دایك بونی پێغەمبەری ...ەزن، ڕای زۆربەیان لەم زانایانە وایە ... ((بەیانی ڕۆژی دووشەممە دوانزەی مانگی بەهاری یەكەم دا لە ڕێكەوتی ۲۰ مانگی ئابی ساڵی (۵۷۰) زایینی وە (۵۳) ساڵ پێش كۆچ كردنی بۆ مەدینەی پیرۆز. لە ماڵی (عبدالمطلب) داخوازی پەروەردگار محەمەدی بەخشی بە ئامینەو محەمەد بە خەتەنەكراوی لە دایك بو (بە هەزاران درودو سەلامی خوای لەسەربێ). ئەم هەواڵە گەیشتە، ((عبدالمطلب)) زۆر پێی دڵشاد بوو گەشایەوە. كە خوای گەورە لە جێگای عبدالله ئەم كوری پێ بەخشین. وە لە دڵی خۆیدا داینا كە ئەم كورە لە جێگاكەی (عبدالله) دابنێ و كە لە بە...كەی ئەوی پێ پڕ بكاتەوە. وەبێ ئاگابوو لەوەی كە چ پاشەڕۆژێك چاوەڕێی ئەم كورە دەكا وە چ پلە و پایەكی ئەبێ؟ وە لە ئەنجام دا ڕزگاركردنی جیهان یەكسەر بەستراوە بەو كورە نازدارەوە. ئینجا (عبدالمطلب) بەگورجی چوو بۆ لای ئامینەو پیرۆزبایی لێ كردو. فەرمانی دا كورەكەیان بۆ كرد بە مەلۆتكەو بردی و تەوافی لە چواردەورەی (كەعبەی پیرۆز) پێ كرد. حەوت جار بە دەوری كەعبەدا گێڕای ... ئەوەی پیرۆز ببێ. وە لە ڕۆژی حەوتەمیا فەرمانی دا چەند وشتریان سەربڕی و كردیان بەشایی و ئاهەنگ لۆغانوهەمو خەڵكی ئەو ناوەیان بانگ كردو عبدالمطلب كورەكەی ناونا ((حمد)) (د.خ). واتە زۆر سوپاس كراو. بێ گومان خوا ئەم ناوە شیرینەی هاوێشتە ناو دڵی (**عبدالمطلب**)ەوە كە تا ئەو ساتە ناوی وا باوو نەبوو لەناویانا. بۆیە قورەیشییەكان ڕوویان كردە عبدالمطلب : ووتیان بۆچی لە ناوی باوو باپیرانی خۆت لات داو ئەم ناوە چی بوو بۆت دانا؟ ئەویش وتی: بەڕاستی دڵم وا بە هیوایە كە ئەم كورەم سوپاس كراو بێ لە ئاسمان و زەویدا. ئینجا یاساو باوی ناو پیاوە گەورەكانی قورەیش وابوو كە منداڵیان ئەبوو ئەیان دایە دایەن لە لادێ كانا. هەتا لە لادێدا بژیت و ئاوو هەوای هەڵمژن و هەوای بێ گەردی ئاسمان لێیان بداو لاشەو هەست و مێشك و ژیرییان بە پێی سروشت گەشە بكات و زمان و وتەیان ڕەوان و خاوێن بێ ووشەی بێگانە كە لە شارەكان دا بڵاون تێكەڵی زمانیان نەبێ. و... خێرە سوارچاكی بن. بەجۆرێك كە لە لادێكان دا ...ون. وەكو زۆران بازی و ڕاكردن و سوار چاكی و یاریەكانی ناو مناڵە لادێیەكان. چەند تیرەیەك لە



دەوروبەری مەککەدا بەناو بانگ بوون. بۆ سەرپەرشتی کردن و بەخێو کردنی و پەروەردەکردن یەکێ لەوانەش تیرەی (بەنی سەعد) بوو. ئینجا ژنانی لادێیی بە پێی یاسای خۆیان هاتن بۆ شاری مەککە بۆ وەرگرتنی منالی ساوا. ژنێک بە ناوی ((حەلیمەی کچی زوئەیب) کە لە هۆزی بەنی سەعد بوو ژنی حاریس کوری (عبدالعزی) بوو پێغەمبەری خوای وەرگرت و بردی بۆ ناو خێڵەکەی خۆیان.

ئینجا پاش مودەتێک کەچوار سال یان پێنج سالێ مایەوە لای حەلیمە بە فەرمانی خوا. ملائکە و فریشتە هاتن سینگیان لەت کردو پیسی دەروونیان لێ هێنایە دەرێ.

پاش ئەوەی کە تەمەنی بوە شەش سالان دایکیشی وەفات دەکا. ئینجا عبدالمطلب دەهێنێتەوە لای خۆی. ئەمەو لە تەمەنی هەشت سالیدا (عبدالمطلب)یش وەفاتی کرد. وە وەسیەتی کرد کە من مردم محەمەد لای ابو طالب بێ. چونکە برای باوک ودایکی عبدالله ی باوکی پێغەمبەری مەزن بوو. تاوای لێ هات پێغەمبەری مەزن گەنج بوو، خۆتەمەنی گەنجێتیش تەمەنی رابواردنەو تەمەنی هەولّ دانە بۆدەست خستنی مالّ و سامان. محەمەدیش (د.خ) گەنجێکی جوان و شیرین و خۆشی پێ کەوتوو لەش ساغ و بەهێزبوو لەگەلّ ئەوەشدا بلّند هیمەت ودەروون بەرزو شێوە شیرین بوو. لەدرێژایی تەمەنیدا لێی نەبیندراوە کە بە شێوەی گەنجێتی بجولّێتەوە و ئارەزووی رابواردن و بەزم و رەزمی وەکو هاوسەرانی کردبێ. وەهەروەها گوێی لە کۆکردنەوەی مالّ و سامان نەبوو. هەولّی نەئەدا بۆ بەدەست هێنانی پلەو پایەی جیهانی. بەلّکو بە پێچەوانەوە هەمیشە ئارەزووی تەنیایی و دورکەوتنەوەی لەکۆمەلّ ئەکرد. وە پاکی و ئەمینی و راستێتی و بێ خیانەتی و دەست و دەم و دلّ پاکێتی کالاّی تایبەتی و هەمیشەیی بوو. وە بەلایەوە وابوو کە پیاوەتی و گەورەیی و جوامێری وا لە پاکی و خاوێنی و رەووشتی جواندا خزمەتی

**لە دایک بوونی تاقە پێشەوای مرۆڤایەتی محەمەد "درودی خوای لەسەربێ"**
**((وما أرسلناك الا رحمة للعالمين))**

مرۆڤانەک لە هەلّەشەیی و هەرەزەیی و خۆ هەلّ برین و ئازاردانی خەلّکی دا. وە نەک لە سامانی گەورەو مالّی زۆردا وەکو پێوەری نەفامێتی وابوو، و لە ژیانیا رازی بوو بە بچووکترین بەش و موچە. وە دەیفەرموو (ئێمە چینێکین تا برسیمان نەبێ ناخۆین. وە کە خواردمان خۆمان تێر ناکەین)). وە خۆشی و رابواردن و لەزەت چەشتن بە لای محەمەدەوە (د.خ) پەیوەندی بەدلّ وەدەرونەوە بوو هەتا جەستەو لاشە. لەبەر ئەمانە محەمەد (د.خ) رازی بوو بەو دەستکەوتە کەمو کورەی لە شوانی و لە ئیشە سادەکانی تردا دەستی دەکەوت. ئەگەر ئەبوطالبی مامی وازی لێ بهێنابایە. بەلاّم ئە بو طالیب کە پیاوێکی هەژارو خێزان دار بوو دەیویست ئیشێکی پڕ لە سوود و قازانج بۆ ئەو برازایە بەرێزەی بدۆزێتەوە. هەوالّی زانی کەوا (خەدیجە) ی کچی خوەیلید لە تیرەی بەنی ئەسەد لە قورەیش بەکرێ پیاو دەنێرێ بۆ بازرگانی و کرێی باشی ئەداتێ. ئەم خاتو خەدیجەیە ژنی بازرگانێکی سەرمایە داربوو، وە ئافرەتێکی ناوازەو بەشەرەف و بەرێزو داوێن پاک بوو. هۆی دەست کەوتنی ئەو سامانەی ئەوە بوو دوو جار لەناو تیرەی مەخزومی دا شووی کردبوو. بەو هۆیەوە بوو بوو بە خاوەنی ئەو سامانەو. بە یارمەتی خزم و کەس و باوەر پێکراوەکانیەوە پارێزگاری سامانەکەی دەکرد. زۆر لە پیاوە ناودارەکانی قورەیش خوازبێنی یان کرد. بەلاّم خەدیجە وەلاّمی کەسیانی نەدایەوە. چونکە دەیزانی تەماعی مولّکەکەی گرتبوونی. وە بریاری وادابوو کە خۆی بە بازرگانیەوە خەیک بکاو ئیتر شوونەکات. ئینجا ئە بوطالیب زانی خەدیجە بە کرێ پیاو ئەنێری بۆ وولاّتی شام بۆ بازرگانی. ناردی بە شوێن محەمەد (د.خ) کە لە تەمەنی (٢٥) سالّیدا بوو، و پێی ووت. برازای شیرینم من پیاوێکی هەژارو خێزاندارم. بیستومە خەدیجە پیاو بەکرێ دەگرێ و لەگەلّ کاروان دا ئەینێرێ بۆ وولاّتی شام. ئایا تۆ ئارەزوو دەکەیت لەم رووەوە لەگەلّیا بدوێم؟ وە بش زانە بەو کرێیەی بە خەلّکی دەدا من رازی نابم. پێغەمبەری مەزن (د.خ) فەرموی چییت بە لاوە باشە وا بکە



مامە گیان. ئەبو طالیب چوو بۆ لای خەدیجەو پێی ووت. خەدیجە ئایا ئەتەوێ محەمەدی ئامۆزات بەکرێ بنێری لەگەڵ کاروان دا دوو قاتی فلان و فیسار کرێی بۆ دابنێی؟ خەدیجە ووتی. تۆ ئەگەر بۆ بێگانەیەک داوات بکردبایە کە ڕقمان لێی بوایە. بەگوێمان ئەکردی چ جای بۆ خزمێکی بەڕێزی وەکو محەمەد (د.خ) ئینجا ئەبو طالب هاتەوەو ئەم وتوێژەی بۆ محەمەد گێڕایەوەو ووتی : ئەمە ڕۆژێکە خوا بۆی ناردویت. ئینجا خەدیجە خۆی ناردی بۆ لای محەمەد(د.خ) وە لە بەر ئەو ئەمینی ودەست پاکی و ڕاستی و جوامێری‌یەی محەمەدی پێ ناسراو بوو هەواڵی بۆنارد کە ئەگەر بچێت بۆ وولاتی شام بۆ بازرگانی دوو ئەوەندەی خەڵکی کرێی دەدەمێ. وە محەمەدیش (د.خ) ڕازی بوو، ئینجا خەدیجە کاروانی خستەڕێ و دایە دەستی محەمەد و نۆکەرێکی خۆیشی کە ناوی (مەیسەرە) بوو لە گەڵی دا نارد. هەرچەندە بەسەر زاری بەناوی یارمەتی دان و خزمەتی محەمەد و ئاگاداری کردنی کارەوانەکەوە بووە.بەڵام وادیارە. لە ڕاستیدا بۆ چاودێری کردنی کارو کردەوەو خووڕەوشتی محەمەد (د.خ) بوو. چونکە خدیجە لە هەموو ڕوویێکەوە لە محەمەد (د.خ) ڕازی بوو حەزی دەکرد بزانێ وەکو بەڕواڵەت و دیمەن ئەوەندە پەسەندو شیرینە لە هەموو ڕویێکی ژیانی دا هەروا ناوازەو ڕێک پێکە. خۆ بێ گومان بە سەفەرێکی زیاد لە دوو مانگ مرۆڤ بە تەواوی دەردەکەوێ و دەناسرێ بێ گومان خەدیجە ئاواتە خواز بوو کە گەنجێکی وەکو محەمەد (د.خ) ببێتە هاوسەری ژیانی ئەگەر مرۆڤێکی ڕێک و پێک بێ. بۆیێ (مەیسەرە) هەمیشە چاودێری محەمەدی کرد لە ڕۆیشتنیانەوە تا هاتنەوەیان. کاروان دەشت بیابانی دابەبەرو تێپەڕی و بە (وادي القری) و مەدیەن و ناوچەی (ثەمود) دا وە لەم ڕێگەیە دا محەمەد زۆر شتی وای دیت کە سەرنجی زیاتر ڕابکێشێ و بیخاتە جیهانی بیرکردنەوەو بەم پێیە چونە شام و کڕین فرۆشتن و ئیش وکاریان بەجێ هێناو بە قازانج و دەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕانەوەو توشی هیچ جۆرە زەرەرو زیانێک نەهاتن کە نزیکی مەکە بونەوە و گەیشتنە (مر الظهران) مەیسەرە بە محەمەد (د.خ) ووت وا جوانە تۆ لە پێشەوە بڕۆیتەوەو موژدەی گەڕانەوەو بێ وەیی و قازانجمان بدەی بە خەدیجە. چونکە ئێستا چاوەڕێمان ئەکات. خاتو خەدیجەش ماوەیەک بوو بە ڕۆژ دەچوە شوێنێکی بەرزو تەماشای ڕێگای شام و چاوەڕێی گەڕانەوەی محەمەد و کاروانەکەی دەکرد. ڕۆژێک ووشترسوارێکی بەدی کرد و دلی کەوتە لێدان تا بۆی ڕون بوەوە ئەوە ووشترەکەی خۆیەتی و سوارەکەش محەمەد (د.خ) کە هاتە ڕیکەوە بە پێی یاسا پێشوازی لێ کردو بەخێر هاتنەوەی کرد. دوای کەمێک حەسانەوە کەوتنە باسی چون و هاتنەوەو کڕین و فرۆشتن و قازانج و سودو ئیش و کارەکانیان و خەدیجە زۆر زۆر دڵشاد بوو لە هەموو کاروبارێکدا. پاشان کاروان هاتەبەرەوەو ساتەر کراو کەل و پەلەکە خرایە ژورەوە. (مەیسەرە) هاتە لای خاتو خەدیجەو بەدرێژی و بە ووردی وەکو تۆماری کردبێ. کەوتە دواندن لە بارەی محەمەدەوە (د.خ) لەڕەوشت و خوو دڵسۆزی و ئارام و جوامێری و ئەمینی و دەست و دەم و دڵپاکی و سۆزو بەزەیی‌یەوە باسی قازانجی زۆرو بە لێشاوی چەند ئەوەندەی جارانی بۆ کرد. وە لەو ڕووەوە کە لە ڕێ کەوتنیانەوە هەتا هاتنەوەیان . تەنکە هەورێکی سپی بەسەر سەریانەوە بوەو سێبەری بۆکردون و لەگەرما و نارەحەتی ڕێگا ڕزگاریان بوە. وە لە نزیکی وولاتی شام ڕاهیبێکی نەصرانی باسی گەورەیی و پایەی پاشەڕۆژی محەمەدی کردوەو ناسیریەتی و داوای کرد لە مەسیەرە کە ئاگاداری بکاو لە پیلانی جولەکە بی پارێزێ. گەلێک شتی گرنگترو سەرسوڕهێنەری تری لەوانەی کە دیبووی بۆی گێڕایەوە. ئینجا بەم باس و خواستە دە ئەوەندەی جاران خۆشەویستی و ڕێزی محەمەد (د.خ) لەدڵی خاتوو خەدیجە دا جێگیر بوو. بڕیاری دا ئەگەر محەمەد (د.خ) پێی ڕازی بێ شووی پێ بکات.

## شووکردنی خەدیجە بەمحەمەد (د.خ)

هەتا نەهات خۆشەویستی محەمەد لە دڵی خاتوو خەدیجە زۆر ئەبوو پەرەی ئەسەند وە هەر چەندە تا ئەو کاتە وەڵامی ئەو هەموو گەورەو سەرۆکانەی قەورەیشی نەدابۆوە کە

خوازبێتییان کردبوو. بەڵام ئێستا ئەبینی خۆی تەمەنی گەورە بووەو گەیشتۆتە (٤٠) ساڵەو محەمەد گەنجێکی شۆخ و شەنگە و لەسەرەتای ژیان دایەو تازە تەمەنی گەیشتۆتە (٢٥) ساڵ. وە مرۆڤێکی وا نی یە کە سورو هەتەر بێ لەسەر ماڵ و سامان تا بە هۆی تەماعەوە چاو لە هەموو شتێ بقونجێنێ. لەبەر ئەمانە پەلەی نەکرد پێ ی ڕابگەیەنێ و ئەیەوێ شووی پێ بکات. وە دەترسا ئەو ئارەزووی خواستنی ئەوی نەبێ. بۆیە هات و ئەم ڕازو نیازەی لای خوشکەکەی خۆی باس کرد. یان وەکو هەندێ ئەڵێن لە لای (نەفیسەی کچی مینەی) هاوەڵی داوای لێ کرد کە بچێتە لای محەمەد و لەم ڕووەوە بی دوێنێ. ئەویش هاتە لای و پێ ی ووت. بۆچی ژن ناهێنی؟ محەمەدیش فەرموی سامان و ماڵم نی یە. ووتی باشە ئەگەر بانگ کرای بۆ لای جوانی و شەرەف و ماڵ و سامان ودارایی تۆ وەلامت چی نەبێ؟ محەمەدیش فەرموی ئەوە چۆن و کێ یە؟ ووتی خاتو خەدیجە پێغەمبەر (د.خ) فەرموی چۆن خۆ من دەزانم هەموو پیاوە گەورەکانی هۆز داوایان کردوەو شووی پێ نەکردوون. ووتی باشە ئەوەیان لەسەر من. بێ گومان محەمەد (د.خ) بەدڵ ئیشەکەی پێ خۆشبوو بۆیە فەرموی: ئەگەر وابێ باشەو زۆرم پێ خۆشە. ئینجا کاتێ نەفیسە هاتەوەو باسەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە خەدیجە دڵشاد بوو کاتێکی نزیکی دانا بۆ خوازبێنی و جێبەجێ بوونی بەیەک گەیشتنیان. محەمەد (د.خ) لەم ڕووەوە لەگەڵ مامەکانیا دواو ئەوانیش چون بۆ لای عەمری کوڕی ئەسەد کە مامی خەدیجە بوو خوازبێنی یان لێ کرد. ابو طالب ووتی محەمەدی برازام وەکو دەزانن هیچ پیاوێک نی یە هاوتایی بکا لە گەورەیی و ژیری وجوانی و پلەو پایەو جوامێریدا. بەڵێ سامان ودارایی کەمە بەڵام ماڵ و سامان وەکو سێبەر وایە و ئەڕواو ئامێنێتەوە. داواتان لێ دەکەم خەدیجەی بدەنێ. وەخەدیجەیش خۆی پێ ی خۆشەو ئارەزووی لە هاوسەرێتی محەمەد هەیە. وە (٢٠) وشتر مارەیی پێشەکی و باشەکی ئەدات. مامی خەدیجەش ووتی: بەڕاستی محەمەد پیاوێکی شایانە وجێگای شانازی یەو دەست بە ڕوویەوە نانرێ و کارەکەیان پیرۆزبێ و بە خۆشی پێکەوە بژین. وە هەر ئەو ڕۆژە خەدیجەیان لە محەمەد مارە کرد بە پێ ی مارەکردنی شەرعی لەسەر شەریعەتەکەی حەزرەتی ابراهیم وە بە پێ ی دەستووری گەورەکانی قورەیش شایی و ئاهەنگ گێڕدراو محەمەد (د.خ) چووە سەرماڵەکەی خەدیجە. ئەم ژن هێنانەی محەمەد و ئەو هاوسەرێتی- یەی لەگەڵ ژنێکی بەشەرەفی وەکو خاتو خەدیجەدا تینێکی گەورەی هەبوو بۆ گەشە پێ گەیشتنی لە هەموو ڕوویەکەوە. چونکە بە هۆی ماڵ و سامانەکەی خەدیجەوە دەسەڵاتی پەیدا کردوە لە ئێش و ئازاری نەبوونی و ڕەنج کێشان ڕزگاری بوو. وە کاتی بۆ خۆش بوو بۆ بیرکردنەوەو سەرنج دان و تێبینی وە پەیوەندی ژن و مێردایەتی لە نێوانیان دا جوانترین شێوە و شیرینترین دیمەن و بەرێزترین نیگاری هەبوو. وە لە چوار چێوەو بەرگی خۆشەویستی و شەرەف و ڕێزگرتن لەیەکتردا درێژەی کێشا هەتا خاتو خەدیجە لە تەمەنی (٦٥) ساڵیدا کەمێک لە پێش کۆچ کردنی پێغەمبەردا بۆ مەدینەی پیرۆز کۆچی دوایی کرد: بەڵێ بەهۆی سامانەکەی خاتو خەدیجەوە محەمەد (د.خ) دەوڵەمەند بوو بەڵام نەک وەکو دەوڵەمەندەکانی تر بکەوێتە شانازی و لووت بەرزی و خۆ هەڵ برین بەسەر ئەم و ئەودا. بەڵکو بە پێچەوانەوە هەتا پێ ی ئەچوو ڕەوشتی جوانتر و خوی شیرینتر ئەبوو. هەمیشە هەوڵی ئەدا بۆ یارمەتی دانی هەژاران و دەستگرتنی لێ قەوماوان و بەزەیی و سۆز تیایا بەرز ئەبووەوە بوو بوو بە نموونەی جوامێری. وە لەناو قورەیشەکاندا بەڕاست گۆو ئەمین ناوی دەرکردبوو.

## گۆشە نشینی محەمەد (د.خ) لە ئەشکەوتی (حراء)دا:

باو بوو لەناو قورەیش دا کە مرۆڤە خاوەن هۆش و بیرەکان هەموو ساڵێک ماوەیەک لەکاتیان تەرخان دەکرد و لە شوێنێکی چۆڵدا ئەژیان و خواپەرستنیان دەکرد. محەمەدیش (د.خ) ئەم باوەی بەهەڵ زانی بۆ ئەوەی بە دڵی خۆی بیر بکاتەوەو سەرنج بداو وردبێتەوە وە ئەم کاتە ئاوازەیە لە خواپەرستی و گەیشتن بە ئامانج لە لەنجامی بیرکردنەوەدا بە سەربەرێ کە دەمێکە بەدڵ و دەروون



ومیشکی پێوەی خەریکە. تا لە پاشە ڕۆژی ژیانیدا لە سەری بڕوات. وە بۆ ئەم مەبەستە گرنگەی ئەشکەوتێکی بەناوی حەراوە هەڵبژارد لەکەژی (نور) لەسەراوردی مەکەوە. نزیکەی (٣) میل لە مەکەوە دووربوو. هەموو ساڵێ لە مانگی ڕەمەزان دا توێشووی ئەبرد و ئەچووە ئەو ئەشکەوتەوە، کە تێشووەکەی تەواو ئەبوو دەهاتەوەو هەندێکی تری دەبردو دەچووەوە ئەوێ تا مانگی ڕەمەزان تەواو ئەبوو ئەوسا ئەهاتەوە. وە لە ماوەی ئەو مانگەدا خواپەرستی دەکرد بە پێی ئایینی ئبراهیم وە سەرەڕای خواپەرستیەکەی لە جیهانی بیرکردنەوەدا ئەژیاو سەرنجی وردی دووربینی ئەدا لە پەراوە کراوەکەی گێتی و بونەوەر. بیری دەکردەوە لەو یاسا شیرین و ئاوازەو سەرسوڕهێنەرە نەگۆڕاوانەی ئەو خوایەی کە ئەم بونەوەرە گەورەیەی بە ستووە بە یەکەوەو بە شیرینیو بە جوانیو ڕێک و پێکی ئەیان با بەڕێوە هەرچەندە محەمەد (د.خ) گومانی ئەبوو لەبونی خوای پەروەردار. وە لەسەر ئایینەکەی ئیبراهیم خواپەرستی دەکرد. بەلاَم لەو ئایینە هیچ شوێنەوارێکی دیاری نەمابوو. وە عەرەبەکانیش هەموو بت پەرست بوون ئەویش کەوتبوە گێژاوی دەروونییەوەو هەمیشە لە لێکدانەوە دابوو. ئەی ووت بێ گومانی ناگونجێ ئەم هەموو شتانە بەو شێوە شیرینەیانەوە لەخۆیانەوە پەیا بووبن. وە یا بتە بێ گیانە ڕەق وتەقانە ئەبێ چی بن و چ نرخ و بەهایەکیان بێ چۆن ئەمانە مرۆڤ لەخواوە نزیک ئەکەنەوە. یا بۆ ئەبێ شەفاعەت و تکایان لێ وربگرێ بێ گومان ئەمانە هەموو درۆ و ئەفسانەو سەر لێ تێکچوونن. سەرنجی مرۆڤەکانی ئەدا کە هەموو گومڕاو سەر لێ شێواون. لەدڵی خۆیدا ئەی ووت: ئەو هەموو ناڕەوایی‌یەی ئەکرێو ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی لە یەکتری ئەکەن. ئایا هەروا ئەڕواو گووم ئەبێ. یان لێ پرسینەوەیەک هەیە؟ کێ ئەم پرسیارە ئەکاو کەی و لە کوێ ئەبێ؟ ئاخۆ کێ ئەم گرۆهی ئادەمیزادە لەم جەورو ستەمە ڕزگار ئەکاو ئەیانکا بەیەک؟ وەکەی و لەکوێ ئەبێ؟ وەک بیری لە وتەکانی گاورو جولەکەکانیش دەکردەوە ئەی بینی لەچەند هەنگاوێکو ئەبێ ئەوانیش شتێکی وایان لە بت پەرستەکانی خزمی خۆی زیاتر نیە و ئەوانیش ڕاست نین وسەر لێ شێواون. وە ئەبێ ڕاستی لەلایەکی ترەوەبێ. هەربەم پێیە پێغەمبەری گەورەمان محەمەد (د.خ) لەم بیرکردنەوەو ووت و وێژە دەرونی‌یە دابوو هەتا تەمەنی گەیشتە (٤٠) ساڵ ئینجا هەر لەم مانگەو لەو ئەشکەوتە دابوو کە خوای پەروەردگار بە (جبرائیل ئەمین) دا پەیامی بۆناردو بە چرای پێغەمبەرێتی دڵ و دەرونی ڕۆشن کردەوەو کردی بە پێغەمبەری جیهانی ئیسلامی‌وکۆتای زنجیرەی پێغەمبەران لەسەر زەوی دا...

## * نیگا (وەحی) دەستی پێ کرد:

محەمەد (د.خ) لەسەرتاوە کەوتە خەوبینین وە خەوەکانی وەکو ڕۆژی ڕوناک ڕاست دەردەچون. وە بەهۆی ئە خەوانەوە بەتەواوی دڵ و دەروونی وەک ئاوێنەی بێ گەردی لێ هات. وە یەکسەر ڕوی دڵی کردە خواو ڕێگای ڕاست. وە لەم کاتانەدا زیاتر ئارەزووی تەنیایی وگۆشەگیری دەکرد. هەتا ڕۆژی دوشەممە و لە (١٧) ڕەمەزان دا بە ڕێکەوتی ((٦١٠ - ٨.٦١٠)) زایینی کوت و پڕ پیاوێکی لێ پەیدا بوو پێی گووت ((محەمەد موژدە بێ تۆ بووی بە پێغەمبەری خوا بۆسەر ئادەمیزادو منیش جبرائیلم)). خاتو عائشە دەفەرموێ (لەسەرتاوە نیگا (وحی) پێغەمبەرێتی بە خەوبینین دەستی پێ کرد. هەر خەوێکی دەدی وەکو بەرەبەیانی ڕاست دەردەچو. وە لەمەوە محەمەد (د.خ) زیاتر تەنهایی بە لاوە شیرین بوو ئەچوو بە تەنیا لە ئەشکەوتی حەرادا خواپەرستی دەکرد و چەند شەوێک دەمایەوەو توێشوی لەگەڵ خۆی دادەبرد. کە توێشوەکەی تەواو دەبوو دەهاتەوە هەندێکی تری دەبردو دەڕۆیشتەوە. هەتا حەق و ڕاستێتی و پێغەمبەرێتی بۆهات، فریشتەیەک هاتە لای و پێی ووت ((بخوێنەرەوە. ووتی من خوێندەوار نیم. پێغەمبەری مەزن ئەفەرموێ: گوشیمی بە خۆیەوە تا ناڕەحەت بووم و ئازارم پێ گەیی. پاشان بەری دام ووتی: بخوێنەرەوە، ووتم خوێندەوار نیم. بۆ جاری دوەم گوشیمی‌یەوە بەخۆیەوە زۆرتر ئازارم پێ گەیی و بەرەڵای کردمەوە ووتی: بخوێنەرەوە. منیش وتمەوە: ئاخر خوێندەوار نیم بۆ جاری سێیەم گوشیمی‌یەوە بە خۆیەوەو ئەمجار زۆر زیاتر ئێشم پێ گەیی و پاشان بەری



د ...زەو ووتی بخوێنەرەوە ئینجا ئەم ...ەتەی بۆ خوێندەوە **((أقرأ بأسم ربك الذي خلق. خلق الانسان من علق. أقرأ وربك الاكرم الذي علم بالقلم علم الانسان ما لم يعلم))**. وە پێغەمبەریش دوبارەی کردەوە. ئینجا پێغەمبەری مەزن گەڕایەوە بۆ ...ەوەو دڵی لێی دەدا هەتا چوە ...ی خاتو خەدیجەی خێزانی و ووتی ((داپۆشن، دام پۆشن)) ئەوانیش د...یان پۆشی هەتا نەختێ ئارامی گرت ...ترس و بیمەکەی لە دڵ دەرچوو. ...ەمجار ڕویکردە خێزانە دڵسۆزەکەی ...فەرموی ((لەخۆم دەترسێم)) خەدیجە ووتی: نەء مەترسە، هیچ کاتێ خوا تۆ توشی خراپە ناکات. چونکە تۆ سەر لە خزم و کەست ...ەدەیت و یارمەتیان ئەدەیت،وە بە ...ەواری یەک کەوتوانەوە ئەچی و ...میوان داری ئەکەیت و پشت گیری لە حەق ئەکەیت. ئەمجارە خەدیجە چوو بۆ لای ((وەرقەی کوڕی نەوفەل)) کە ئامۆزای بووەوە محەمەدیشی (د.خ) لەگەڵدابوو خەدیجە ووتی ئامۆزای بەڕێزم گوێ بگرە لەم برازایەت بزانە چی بەسەر هاتووە؟ پێغەمبەریش بەسەرهاتەکەی خۆی گێڕایەوە. وەرەقەش ووتی: ئەو پیاوە ئەو فریشتەیەیە کە مژدەی داوە بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرەکان. خۆزگە گەنج بوومایەو بمامایە لەو کاتەی خزمکانت دەریان دەکردی. پێغەمبەری مەزن(د.خ) فەرموی بۆچی دەرم ئەکەن؟. ووتی بەڵێ.هیچ پیاوێک نەبوە پێغەمبەرێتی هێنابێ و دوژمنایەتی لەگەڵدا نەکرابێ. ئەگەر بگەمە ئەو ڕۆژە یارمەتیێکی گەنگت ئەدەم. بەڵام وەرەقە مردو ...نیگاو ((وحی)) وەستا. هەر لەوکاتەدا جبرائیل پێی ووت ئەی محەمەد تۆ پێغەمبەری خوای بۆ سەر ئادمیزاد و جنۆکە. ئەبێ بانگیان بکەی بۆ سەر ئایینی ئیسلام و بۆ پەرستنی خوا بە تاک و تەنیا بۆ ووتنی ووشەی (( **لا الە الا اللە** )) واتە، بێجگە لەخوا کەس شایەنی پەرستن نیەو نابێ بەندایەتی بۆ کەس بکرێ. ئەمجارە دەستی گرت و بردی بۆ سەر ئاوێک و خۆی دەستی کرد بە دەست نوێژ شورین و محەمەد (د.خ) سەرنجی ئەدایە هەتا فێربوو ئەویش دەسنوێژی شۆری جبرائیل پێشی کەوت و محەمەد لەدوایەوە دوو ڕکات نوێژی بەکۆمەڵ (جەماعەت) یان کردو بە تەواوی فێری دەست نوێژو نوێژ کردن بوو...)).

بەم جۆرە پێغەمبەری گەورەمان ئەم پەیامەی گەیاندە هەموو ئادەمیزاد . بۆیە خوای گەورە بە هەموو تواناو دەسەڵاتی خۆی منەت لەسەر موسڵمانان دەکات کە ئەو پێغەمبەرە ڕەحمەت و بەرەکەتەی بۆ ناردون دەفەموێ **((لقد من الله على المؤمنين اذ بعث فيهم رسولاً من أنفسهم يتلوا عليهم أياته ويزليهم ويعلمهم الكتاب والحكمة))**. خوای گەورە منەت دەکا لەسەر بڕوادارەکان چونکە هەر لە خۆمانەوە پێغەمبەرێکی بۆ ناردون. خەڵکی لە ڕێگای نەفامی و تاریکی دەرهێنا بۆ نورو ڕۆناکی دونیا وقیامەت. بەڵێ ئەو هەموو نەتەوانەو ئەو میللەتانەی بەیەکەوە بەست وکردی بە یەک پارچە. هەموی کردنە یەک میللەت. ناوی نا میللەتی ئیسلام. یەک بەرنامەی برەنامەی قورئانی یەک سەرکردە **محەمەد المصطفى (د.خ)**. یەک ڕەنگیان هەبێ یەک ڕاڕدویان هەبێ کە بۆ قیبلەیە. وە ڕای زۆربەی فەیلەسوفەکانیش سەرسوڕهێنەرە دەربارەی پێغەمبەرەی پێشەوا ((شیرۆکە عەمیدی کۆلێژی یاسایە لەجامیعەی ((ڤینا)) موسڵمان نییە بەڵام مرۆڤێکی وەسف کارە دەڵێ **((ان البشرية لتفتخر بانتساب رجل كبير كمحمد اليها انه رغم اميته استطاع قبل بضع عشر قرنا استطاع ان يأتي بتشريع سنكون نحن الاوروبيون اسعد ما نكون لو وصلنا الى قيمته بعد الفي عام))** دەڵێ هەموو ئادەمیزاد دەبێ شانازی بکات بەوە کە محەمەد(د.خ) یەکێکە لە ئادەمیزاد. بۆ؟ لەگەڵ ئەوەش کە نەخوێندەوار بووە پێش (١٤) سەدە یاساو دەستورێکی لەلایەن خواوە هێناوە کە ئێمەی ئەوروپیەکان ئەگەر پاش (٢٠٠٠) هەزار ساڵ بگەینە ئەو یاساو دەستورە. ئێمە دڵخۆشترین ئادەمیزادین)). بەڵێ پێغەمبەری پێشەوا نەخوێندەوار بوو کە چوە ناو ئەشکەوتی حەرا نەخوێدەوار بوو **(دخل الى غار حراء اميا وخرج من غار حراء معلما للبشرية جمعاء)**. کە چوە ناو ئەشکەوتی حەڕا بە نەخوێندەواری چوو. بەڵام کە هاتە دەرەوە لەناو ئەشکەوی حەڕا بوە مامۆستای هەموو مرۆڤایەتی. بوە مامۆستای مامۆستایان)..





## ماموّستاو زانای پایەبەرزی ئیسلامی

# شێخ محەمەد شەعراوی

## دوا ماڵئاوایی لێ کردین

بەپێنووسی : حاجی عەلی مەولود

دوای ئەوەی ماموّستاو زانای پایەبەرزی ئیسلامی (شێخ محەمەد شەعراوی) ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٨ زایینی بەرامبەر (٢٣)ی سەفەری ساڵی /١٤١٩/ ی کۆچی؛ بە هۆی نەخۆشی‌یەکی کوشندەی درێژ خایەنەوە لە شاری (قاهیرە)ی پایتەختی میسر لە تەمەنی (٨٧) ساڵیدا، دوا ماڵئاوایی لێ کردین و لە ڕێگای ئاژانسەکانی جیهان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی میسرەوە؛ هەواڵی کۆچی دوایی و مەرگیمان پێ گەیشت؛ کە سەرجەم جیهانی ئیسلامی هەژاند، ئێمەش بەم بۆنەیەوە وێڕای ڕاگەیاندنی هاوخەمیمان؛ گەرمترین پرسەو سەرەخۆشی لە خۆمان و تێکڕای موسڵمانانی کورد و عەرەب و جیهانی ئیسلامی دەکەین و داواکارین لە یەزدانی مەزن؛ جێگای بەهەشت بێت و سەبوری بە کەس وکارو دۆست و هاوەڵانی بدات...

* ئاشکرایە ماموّستا وزانای نەمر.. ناوی تەواوی (شێخ محەمەد متەوەلی شەعراوی) یەو لە بەرواری ١٦ی نیسانی / ١٩١١ی زانیینی لە



گوندی ((دقادۆس))ی دەلتای نیلی سەر بە پارێزگای (الدهقلیه)ی کۆماری عەرەبی میسر لە بنەماڵەیەکی شێخ زادەو ئایین پەروەر چاوی بۆ ژیان هەڵهێناوەو هەر لە منداڵییەوە، خولیای خوێندنی قورئانی پیرۆزی کەتۆتە سەرو لە گوندەکەی خۆی دا خراوەتە بەر خوێندن و بەو تەمەن منداڵییەی توانیویەتی سەرجەم قورئانی پیرۆز لەبەر بکات و دواتر لە پەیمانگای ((الزقازیق))ی ئیسلامی لە میسر؛ خوێندویەتی و بە سەرکەوتویی تەواوی کردووە، پاشان؛ لە (کۆلیژی زمانی عەرەبی لە جامیعەی ئەزهەر) وەردەگیرێت و بۆ یەکەم جار لە سالّی (١٩٤١)دا، بڕوانامەی جیهانی لە بواری ئایینیدا؛ بە دەست دەهێنێ ئینجا لە سالّی (١٩٦٢) دا دەکرێت بەسەرپەرشتیاری زمانی عەرەبی لە زانکۆی ئەزهەرو هەروەها لە سالّی (١٩٦٤)یشدا کراوە بە یاریدەدەری نوسینگەی ئەزهەری ئیسلامی و دواتر لە سالّی (١٩٧٢)دا دەکرێت بە سەرۆکی خوێندنی باڵا لە کۆلێژی شەریعە لە شاری (جدده) و لە سالّی ١٩٧٦ تا ١٩٧٨ یەکەم پۆستی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی میسری، وەردەگرێت و لە سالّی (١٩٨٠)شدا دەبێت بە ئەندامی (کۆڕی لێکۆڵینەوەی زانستە ئیسلامیەکان) و لە سالّی ١٩٨٧یش پلەی ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکگرتووی جیهانی ئیسلامی؛ پێ دەسپێردرێ؛ شایانی باسە ((شێخ محەمەد الشعراوی)) ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە کتێبی ئایینی بە چاپ گەیاندووە؛ تەنانەت زۆریش بایەخی بە دنیای ئەدەب و هونەری بانگ بێژی و موناجاتی ئایینی و شیعری کۆمەڵایەتی دەداو بۆ ئەم مەبەستەش چەند کتێبێکی بە چاپ گەیاندووە لەوانە: ((المرأة في القرأن - ئافرەت لە قورئاندا)؛ (المعجزة الكبرى) (موعجیزە گەورەکان) (منة السؤال و جواب في الفقه الاسلامي) (القضاء والقدر) (باوەڕی موسڵمان) و (خێزانی ئەشکەوتەکە) و (مریەم ومەسیح) و (من مشاهد يوم القيامة)، ئەمەو ماموستای نەمر، گرنگترین کتێبی بە ناوی (موعجیزە زانستیەکانی قورئان)ی لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەرزمانی ئینگلیزی، شایانی باسە: مەرگی ناوەخت و ناوادەی (شێخ محمد الشعراوي) جگە لەوەی کە جیهانی ئیسلامی هەژاند گەورەترین درزی خستە ڕێبازی پیرۆزی ئایینی ئیسلامەوە؛ بگرە بۆشاییەکی گەورەی لە کۆمەڵ وکۆمەڵگای عەرەبی ئیسلامی میسری دا، دروست کرد کە سەرجەم کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی جیهانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردو هەریەکە ولە لای خۆیەوە هەواڵی کۆچی دڵتەزێنیان بە گوێی خەڵکدا؛ چرپاند و بە کەلێنێکی گەورەو مەزنیان ناوزەد کرد، بەڵێ... ماموستاو زانای پایەبەرزی عەرەبی ئیسلامی؛ شێخ شەعراوی نەمر... جگە لە وتارو لێدوانە ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیەکانی، دەنگ و سەدایەکی بە جۆش و خرۆشی لە بواری بانگ بێژی دا هەبووە کە سەرجەم خەڵکی میسری عەرەبی گوێیان بۆ هەڵدەخست... مەخابن بۆ دوایین جار ماڵئاوایی لێکردین و لەگەڵ موعجیزەکانی مەرگ و ژیانەوەدا؛ خۆی گەیاندە کاروانی سەروەرانی دیکەی ڕێبازی ئیسلام و ئەستێرەی تەمەنیان بە ئاسمانی (قاهیره)دا ڕاکشاو لە تابوتێکی شیعراویدا؛ بەرەو دوا مەنزڵی یاوەرانی ڕێگای ئیسلامی گرتەبەر...

هەزاران سلاو ... لە گیانی پاک و بێ گەردی ماموستا و سەرجەم ڕێبوارانی ماندوونەناسی ڕێبازی پیرۆزی ئایینی ئیسلام... ڕۆحتان شادو گۆڕتان پڕ نوور ...





٧

# مەلا محەمەدی کۆیی

## (( مـــەلای گـــەورە))



***جەلال حەمەدەمین***

میـژووی کـورد لەگـەل ئیسـلام دا پـڕ لــە شــانازی و سـەروەرییە، هەر لە سەرەتای پابەند بوونی کورد بە ئـایینی پیرۆزی ئیسلامەوە تا ڕۆژگاری ئیمرۆ و بەدرێژایی چەندان سەدەن بە شداریەکی شەرەفمەندانەی تێدا کردووە.

جگە لەوەی کە چەندان سەرکردەو سوارچاکی لێهاتووی بە جیهانی ئیسلام بەخشیوە، کە لە ڕۆژگارە جیاجیاکاندا ئەرکی بەرگری کردن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ولاتانی موسڵمانانیان گرتۆتە ئەستۆ، هەر ئەو ((سـەلاحەدینی ئەیوبی)) کە موسڵمانانی لە شەڕی خاچ پەرستان پاراست و زۆر دلێرانـە توانـی بەریـەرچیان بداتـەوە وشکسـت بـە هێرشەکانیان بهێنێـت و ((قـودس)) لـە خـاچ پەرسـتان ڕزگار بکات، ئەوا لە هەمان کاتدا گەلی کورد ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لـە پێش خسـتن و پاراسـتنی کـەلتوورو فەرهەنگی ئیسلامی، و لەم بوارەدا چەندان زانای بلیمەت و ناوداری بە جیهانی موسڵمانان بەخشیوە.

لە مێژووی تازەی گەلەکەمانیش دا بنەماڵە ئایینیەکان و پیاوە ئایینیەکان بە پێشـەنگی کاروانی وشیارکردنەوەو ڕاپەڕینی نەتەوایـەتی و دادی کۆمەلایـەتی دەژمێردرێـن، زۆربەی هەرە زۆری شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردستان، کە بۆ هێنانـەدی ئـاواتی گـەلی کـورد بەرپابوینـە، پیـاوانی ئـایینی ڕابـەرو سـەرکردەیان بـوون وەک مـلا مسـتەفای بـارزانی ((بـارزانیی نـەمر)) شـیخ مـەحمودی حـەفید لـە کوردسـتانی باشـوورو شـێخ عوبیدوڵـلای نـەهری لـە کوردسـتانی بـاکورو قـازی موحەمـەد لـە ڕۆژهـەلاتی کوردستان.

### بنەماڵەی جەلی زادە

بنەماڵـەی جـەلی زادە، بنەماڵەیـەکی ئـایین و زانسـت پـەروەرە، بەرەچەڵـەک دەگەرێتـەوە سـەر ((شـێخ ئیـبراهیم))ی جـەزیری، لـە کۆچێکیـاندا بـۆ گونـدی ((بێگـەلاس))ی ناوچـەی پشـدەر دێـن، لـە دوای ئـەوە بەشـێکیان دێتـە گونـدی ((شیوەشـان)) لـە بنـاری یـای کۆسرەت، کـوڕە گـەورەی مـەلا زادەی شیوەشـان کـە نـاوی مەلا عەبدوڵلا دەبێت دەچێتە گوندی جەلی ((گوندێکە لە بناری چیای ئاوەگرد کە لـە درێژ بوونـەوەی چیـای سەفین پێـک دێت و چەند سـەعاتێک بە پێ لە کۆیە دوورە)).

لەبەر بلیمـەتی و لێهـاتوویی و خۆشەویسـتی ئەو مەلایـە لەلایەن خەڵکەوە بە (کاکی جەلی) ناوبراوە.

لەسـەردەمی میرنشـینی بابـان و لـەو کاتـەی کـە ناوچـــەی کۆیـــە لـــە ژێـــر دەســـەلاتی بابـــان دا بووە(عـەبدولرەحمان پاشـای بابـان)) لەبـەر لێهـاتوویی و بلیمـەتی (( مـەلا عـەبدولرەحمانی جـەلی)) لـە سـاڵی ١٧٩٥ ز داوای لێدەکات کە بێتە شاری کۆیـە، ئیتر لـەو کاتـەوە ئـەو بنەماڵەیـە لـە کۆیـە نیشـتەجێ بـوون و بـە ((جەلی زادە)) ناسراون.



## مەلا موحەمەدی کۆیی کێیە؟

ناوی موحەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا ئەسعەدی جەلی زادەیە، لە ساڵی ١٨٧٦ ز لە شاری کۆیە هاتۆتە دونیاوە.. دایکی ((عایشە)) کچی حاجی بەکراغای حەویزییە (کە لە پیاوە خواپەرست و ناودارەکانی شاری کۆیە بووە، یەکێک لە کارە گرنگەکانی ئەو پیاوە، دروست کردنی مزگەوتی گەورەی کۆیەیە، کە شوێنەوارێکی گەورەی ئیسلامی کوردستانە، کە تا ئێستا ماوەو بە مزگەوتی گەورە ناو دەبرێت، لە ڕاستیدا شوێنەوارێکی پڕ لە هونەرو جوانکارییە).

مەلا عەبدوڵلای باوکی مەلا موحەمەد، لە دۆست و هاوەڵە هەرە نزیکەکانی شاعیری بیری نەتەوەیی کورد حاجی قادری کۆیی بوە، بۆیە حاجی دوای کۆچی بۆ ((ئەستەنبوڵ)) چەند نامەیەکی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ کردووە، و لە خۆشەویستی حاجی بۆ مەلا عەبدوڵلا و ئەو یادگاریانەی لەگەڵیدا هەی بووە، چەندان شیعری بۆ ناردووە وەک حاجی بە مەلا عەبدوڵلا دەڵێ:

بە غەیری جەدی ئێوە کێیە دانا
لە کوردستان بناغەی عیلمی دانا

یاخود دەڵێت :

بە فیکرت دێ زەمانێ چوینە باڵەک
بە پێخاوس نەکەوشە بوو نەکاڵەک

مەلا موحەمەد لە لای باوکی دەخوێنێ و هەر لەسەر دەستی ئەو لە تەمەنی (١٩) ساڵیدا مۆڵەتی (اجازە) ی مەلایەتی وەردەگرێت. لە دوای کۆچی دوایی باوکی ئەو شوێنی دەگرێتەوە، تا دوا جار لە ساڵی (١٩٤٣) ماڵئاوایی یەکجارەکی لە دونیایە دەکات و دەچێتە دونیای ئەبەدی. مەلا موحەمەد جگە لە کاری مەلایەتی چەندان پلەو پایەی گەورەی لە دەوڵەت وەرگرتووە. لەساڵی ١٩١٦ و لە سەردەمی عوسمانییەکان دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی (ولایەت) لە موسل. ساڵی (١٩١٩) و لەسەر دەمی هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان دەبێتە (قازی کۆیە). لە ساڵی (١٩٢٤) دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندنی عیراق،و ئەنجومەنەی کە ژمارەی ئەندامەکانی بۆ سەرتاپای عێراق (٨٦) ئەندام بووە. میستەر های کە حاکمی سیاسی بەریتانی بووە لە کتێبەکەیدا ((دوو ساڵ لە کوردستان)) باسی لێهاتووی و بلیمەتی ئەو زاتە دەکات و ئەوەی لێ باس دەکات کە زانایەکی ئایینیەو زۆر بایەخ بە ژیانی کۆمەڵایەتی و دونیایی دەدات.

## مەلای گەورەو زانستی سەردەم

مەلای گەورە وەک زانایەکی ئایینی کارامەو لێهاتوو، شارەزاییەکی زۆری لە ئایینی ئیسلام بووەو بەدیان قوتابی و زانای ئایینی لە ژێر چاودێری ئەودا خوێندنیان تەواو کردوەو مۆڵەتی مەلایەتیان وەرگرتووە، هەر لەبەر ئەمەیە کە مەلایەکان و فەقێیەکانی کوردستان بە ((مەلای گەورە))یان ناوبردووە. مەلا موحەمەد چەندان کتێبی بە زمانی عەرەبی و کوردی لە بوارە جیاجیاکانی زانستی ئیسلام دا داناوە.

ئەمەو لە بواری زانستی سەردەم، ئاگادارییەکی باشی لە پێشکەوتنی زانستی سەردەم بە لقەکانی فیزیاو کیمیاو .... تاد بووە. دەرکی بە سوودی ئەو زانستانە کردووە لە پێشکەوتنی کۆمەڵ، بۆیە هەردەم هانی خەڵکی داوە بۆ فێربوونی ئەوزانستانە واتە دەیویست کوردیش وەکو گەلانی پێش کەوتوو سوود لەو زانستانە وەربگرێت و بچێتە ڕیزی ئەوانەوە.

دەتوانین بڵێین هەروەکو زانا موسڵمانە عەرەبەکانی وەک ((جەمالەدین ئەفغانی)) و ((موحەمەد عەبدە))، کە هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ پێشخستنی کۆمەڵگەی موسڵمانی عەرەب و گونجاندنی لەگەڵ پێشکەوتنی سەردەم، ئاوەها هەوڵی بەردەوامی ئەویش گەر زیاتر نەبوو بێت کەمتر نەبووە. بۆ یەکەم جارو لە ساڵی ١٩١٣ ز لەسەر داوای مەلای گەورە لە ((والی))( موسل)ی ئەوسای عوسمانییەکان، قوتابخانەیەک لە کۆیە دەکرێتەوە، کە لە دواییدا بووە



بنکــەی پێگــەیاندنی هــەزاران ڕۆشــنبیرو سیاســی و شۆڕشگێڕ.

جەنابی مەلای (( هەروەکو هێندێک لە خەڵک لەبەر ڕێزو خۆشەویستیان بۆ ئەم زاتە بەم ناوە ناویان دەبرد )).

## بیری نەتەوایەتی لای جەلی زادە

مەلای گەورە نەک هەر وەکو زانایەکی ئایینی و ڕوناکبیرێکی کۆمەڵایەتی ڕۆڵی خۆی بینیوە و بەس، بەڵکو وەک ڕابەرێکی نەتەوەیی هەردەم سەرقاڵی وشیار کردنەوەی خەڵک بووە بۆ بیری نەتەوایەتی. لە هەموو کۆڕو دانیشتنێکی تایبەتی و گشتیدا لە ڕێگەی شیعرەکانیەوە بێت یاخود بە گوتار. کوورەی بیری نەتەوایەتی لای خەڵک جۆش داوە.

زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی کە بە زمانی ساکار بۆ خەڵکی دارشتووە تەنیا مەبەستی وشیار کردنەوەی خەڵک بووە لە بوارەکانی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و ئاینی، چونکە شیعر بۆ پێکانی مەبەست زیاتر و کاریگەرتر لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە. ئەمەو هەموو کات شیعرە نەتەوایەتییەکانی حاجی قادری کۆیی بۆ خەڵک خوێندۆتەوە.

مەلای گەورە لەو کاتەی کە زۆر لە پیاوانی ئاینی ئەوسا، بیرو بۆچونێکی ڕاستیان دەربارەی جەژنی نەورۆزی نەتەوەیی کورد نەبووە، هێندێک خەڵکی نەفام و دواکەوتوی ئەوسا یادکردنەوەیان بە کوفر لە قەڵەم داوە، ئەوا مەلای گەورە لە یادی نەورۆز لە ساڵی (١٩٣٨) ز لەبەر دەرگای سەرای کۆیەی ئەو کات، ووتاری بۆ خەڵک خوێندۆتەوەو پیرۆزبایی لێ کردوون. مەلای گەورە لەبەر ئازایی و لێهاتوویی زۆر جار بۆ داکۆی کردن لە دۆزی کورد، زۆر دلێرانە وەستاوە، جێی خۆیەتی لێرەدا چەند نموونەیەک بخەینە ڕوو.

لە کاتی شۆڕشی شێخ مەحمود دژی ئینگلیزەکان، کاربەدەستێکی ئینگلیز دێتە شاری کۆیەو دەبێتە میوانی (( جەمیل ئاغای )) قایمقامی ئەو کاتی شاری کۆیە، بۆ بەشداری کردن لەم دانیشتنە بەدوای مەلای گەورە دا دەنێرن، لەکاتی دانیشتندا کابرای ئینگلیز هێرش دەکاتە سەر شێخی نەمر، جەنابی مەلای زۆر دلێرانە وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێ: (( خۆ شێخ مەحمود نەهاتووە وڵاتی ئێوە داگیربکات، ئێوە وڵاتی ئەوتان داگیر کردووە، مافی خۆیەتی بەرگری لە وڵاتەکەی بکات، ئەگەر کەسێک بێت و وڵاتی ئێوە داگیر بکات ئێوە بەرگری ناکەن؟ )) ئا بەم جۆرە ڕووبەڕووی ئەم کەسانە بۆتەوە. هەروەها لە کاتی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود، ئینگلیزێک ڕووی پرسیاری دەکاتە مەلای گەورەو دەڵێ ڕات چییە بەرامبەر حکومەتی شێخ مەحمود؟

لە وەڵامدا دەفەرموێ: کوردیش وەکو هەموو گەلانی دونیا مافی خۆیەتی کە ببێت بە حکومەت، و شێخ مەحمودیش لە هەموو کەس لێهاتووترە بۆ ئەوەی ببێتە ((مەلیک)) ی کوردستان، بەڵام ئەو پانتاییە تەسکەی ئێوە بۆ حکومەتی شێخ مەحمود داتان ناوە، جێگەی سوپایەک نابێتەوە مەشقی تیادا بکات.

## شۆڕشی کۆمەڵایەتی لای مەلای گەورە

کۆمەڵگەی ئەوسای کوردستان، بەدەست کۆمەڵێک نەخۆشی و دیاردەی دژێوی کۆمەڵایەتییەوە دەیناڵاند، ئەو زاتەش وەک زانایەک و خەمخۆرێک و بۆ وەستان لە دژی ئەو دەردە کوشندانە هەردەم لە ڕیزی پێشەوە دابووە، لەوانە شەڕو ئاژاوەی بنەماڵە گەریی و تیرە گەریی. مەلای گەورە بە هۆی ڕێزو خۆشەویستی خەڵک لە هەموو لایەکەوە بۆی، هەردەم ڕۆڵی باش و سەرکەوتووانەی هەبووە لە دامرکانەوەی شەڕو ئاژاوەی ناو خەڵک.

تەنانەت ڕێزێکی زۆری لەو دیان (مەسیحی) و جولەکانە گرتووە کە لەگەڵ موسڵمانەکان ژیاون و هیچ کات نەیهێشتووە کەسانێکی نەزان لە پەنای دینەوە



نـزاریـان بدەن. هەردەم فەرموویەتی ئێوە دەبێت هەموو برای یەک بن و گەروانەکەن سەرکەوتوو بن لـە لایـەکی ترەوەو ئەوکات لە کوردستاندا، کەسانێکی وا هەبوون بە ناوی پیرۆزی ئیسلامەوە خەڵکیان فریودەداو جۆرەها شتی نابەجێ و خورافیاتیـان لەناوکۆمـەڵ بـڵاو دەکـردەوە بـۆ مەبەستی چەوساندنەوەی خەڵک، لـەو کاتـەدا مـەلای گەورە زۆر نازایانـە دژیـان دەوەسـتێت و بـۆ خـەڵک روون دەکاتەوە کـە ئـەم کـارەی ئـەوان دوورە لـە ئـاییـنی ئیسلام، لەسەر ئەم کارەی تووشی کێشەیەکی زۆر بووە.

لە هەمان کاتیش دا رێزی زۆری هەبووە بـۆ ئـەو کەسـانەی بە راسـتی شـێخ و خواپەرسـت بـوون و لەوانـە دۆستایەتی باشی لەگەڵ شێخ تاهیری هەڵەبجە هەبووە، هەر وەکو چۆن مـەلا عـەبدوڵڵای بـاوکی مـەلای گـەورە دۆستایەتی لەگەڵ کاکە ئەحمـەدی شـێخ هـەبووەو نامـە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا هەبووە.

لـە رۆژگـارێک کـە گۆرانـی ووتـن و گـوێ گرتـن لـێبـە لای خـەڵک بـە (حـەرام) لـە قەڵـەم دراوە، کـەچی ئـەو زۆر حەزی لە دەنگی خۆش کردووەو خۆیشی خاوەنی دەنگێکی بەسۆز بووە.

## کتێبەکانی مەلای گەورە

مەلای گـەورە وەک زانایـەکی ئـاییـنی گـەورە، زۆر کتێبی بـە نرخـی بـەزمانی عـەرەبی و کـوردی دانـاوە، کـە زۆربـەیان تـاکو ئێسـتا بـە چـاپ نەگـەیاندراون، گـەر سەرجەمیان لە چاپ بدرێت ئەوا لـە (٢٠٠٠) بیست هەزار لاپەرە کەمتر نابن. ئەمەیش کتێبەکانیەتی :

**ناوی کتێبەکان بە زمانی عەرەبی:**

١- المعقول في علم الاصول.
٢- الاكلام الجديد.
٣- أيها المآرب في أثبات الواجب.
٤- القائد في العقائد.
٥- كشف الاستار في مسألة الاختيار.
٦- الاله والطبيعة والعقل والنبوة.
٧- ضياعان عظيمان.
٨- المشاهد على طراز المقاصد والموافق.
٩- رسالة في حقيقة الاسلام واخرى في حقيقة الايمان.
١٠- المعجزات والكرامات.
١١- الاشخاص الستة.
١٢- الحدس سلم الارتقاء.
١٣- غايتي واملي في علمي وعملي

**بە زمانی کوردی**

١. دیاری مەلا محەمەد (دیوانێکی شیعرە)
٢. عەقیدەی ئیسلام.
٣. مجدد (نوێ کەرەوە).
٤. تەفسیری کوردی لە کەلامی خواوەندی.

کە ئەمەیان تەفسیری قورئانی پیرۆزە بە سێ بەشەوە.
لە کۆتاییدا دەڵێین کە بە چەند دێرێکی کورتی ئەوهادا، ناتوانین بـە شـێکی زۆرکـەمی لێهـاتوویی و دڵسـۆزی ئـەو زانا گەورەیە دەربخەین بەڵکو دڵۆپێکە لە دەریایەک، بەڵام وەک ئەمـەک و وەفاداریـەک و یادکردنەوەیـەک ئەمـەمان خستەروو.

خوێنەر دەتوانێ زیاتر لە جیهانی ئەو زانا گەورەیە شارەزابێت گەر کتێبی مامۆستا (عبدالخالق علاءالدين) بـە نـاوی ((مـەلای گـەورە زانـاو ئـەدیب و شـاعیر)) بخوێنێتـەوە، کـە سـەرچاوەی ئـەم چـەندێرە بـوو کـە نووسیمان.





# شێخ عومەر بالیسانی

## ١٩١٠ - ١٩٨٩

* دلێر بابە شێخ نەقشبەندی *



کوان وکێن ئەوانەی چارەنوس بەخت و یاریان بووە لە گرکانی وەیشومەو کارەسات دا ، مامەڵەیان لەگەڵ ویژدانی مرۆڤ و دەوروبەرو بیروبۆچونەکانی سەردەم کردووە ، لە کوانوی تەمەنی شکۆداری ، کۆمەڵ و کۆمەڵگای کوردەواری و لە بنەماڵە ئاینی پەروەرەکانی کوردستانا رووبەروی ژیان و زیندەگی تاڵ و شیرین بۆتەوە، بەڵێ جەنابی مامۆستا شێخ عومەر بالیسانی یەکێکە لەو زاناو ناودارو ئەدیب و ئاینی پەروەرانەی تەریقەتی نەقشبەندی، لە ساڵی ١٩١٠ ی زایینی بەرامبەر ١٣٢٩ی کۆچی و لە بنەچەی سەیدەکانی پیر خدری شاهۆیی لە گوندی بالیسان چاوی بۆ ژیان و خزمەت کردن بە ڕێبازی پیرۆزی تەسەوف وزانستە ئاینیەکان و گەردون دا کردۆتەوە.

مامۆستا شێخ عومەر هەر لە تەمەنی شەش ساڵیەوە، لە خزمەت شێخ تەهای باوکیدا، خوێندویەتی دوای وەفاتی باوکی لە قوتابخانەی مەلا ئەفەندی لە هەولێر خوێندویەتی و لەسەر دەستی ئەودا ئیجازەی عیلمی پێ دراوە. لە دوای وەرگرتنی ئیجازەی عیلمی گەڕایەوە بالیسان و هەر لە قوتابخانە بەناو بانگەکەی باوکی دا ، دەستی کردوە بە تەدریس و قوتابخانەکەی گرتە ئەستۆ کە لە تێکڕای شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گەورە وە روویان تێ کردوە بۆ خوێندن شان بە شانی مدرسەو مزگەوت ئیرشادی موسڵمانانی کردووە لەسەر ڕێبازی تەریقەتی نەقشی و قادری، دواتر لە ساڵی (١٩٥٢)ی زایینیدا هەمان قوتابخانەی گوازتەوە شاری هەولێر و درێژەی بە تەدریسی ئایینی دایەوە کە چەندین مامۆستای بەناوبانگ و زانای ئایینی لە خزمەتیدا ئیجازەیان وەرگرتووە لەوانەش ( مامۆستا شێخ محەمەد بالیسانی برای و مەلا عومەر گۆرەشێری و مەلا سەعیدی نواوەو مەلا ئەنوەری شەمشولەیی و شێخ ئەبوبەکری برا بچوکی کە ئێستا لە هەمان مزگەوت دا لە گەڕەکی ستاقان ئیمام و خەتیبە ئەمە و ئەم زانانە وچەندین مامۆستاو زانای دیکەش).

دوا ی پێگەیشتنی شێخ محەمەدی بالیسانی برای و دانانی لە جێگای خۆی بۆ تەدریس، دەستی کرد بە ئیرشادات و بلاوکردنەوەی تەریقەتی نەقشبەندی و تەقواو عیبادەت لە ناوچەکانی خۆشناوەتی و دەشتی هەریر و دۆڵی ئاژگەو زرگوێز و ناوچەکانی ناو شاری هەولێرو ناوەڕاست و باشوری عیراق لەوانە شاری ڕومادی و فەلوجەو...تاد.

مامۆستای ئەمر لە بواری ئەدەب و تەسەوف و شیعردا دەورێکی گرنگ و باڵای هەبوو، کە زۆر لە نوسین و وتاری ئایینی وشیعری تەسەوفی لە چەند دەستنوسێکدا بلاوکردۆتەوە و یەکەم شاکاری شیعری (عەقیدە)ی لە ساڵی ( ١٩ ) لە بەغدا چاپ کردووە لە ژێر ناو نیشانی (ڕێگای ڕاستی ژین بۆ دنیاو دین) بلاوکردۆتەوەو جگە لە نوسینی چەندین دەستنوسی تری شیعری و قەسیدەی ئایینی و **مەرثیە** بۆ مەلا ئەفەندی هەولێر. بەڵام مەخابن ئەم زانا بەناوبانگەی زانست و تەریقەت و ئەدەب و تەسەوف ، لە ڕۆژی ١٩ نیسانی ساڵی / ١٩٨٩ ی زایینی بەرامبەر (١٣) ی ڕەمەزانی ساڵی/١٤٠٩کۆچی دوا ماڵئاوایی لێ کردین و گیانی پاک بێ گەردی کردە قوربانی وشەی پیرۆزی ئایین. ئێستاش لە دوای وەفاتی، مزگەوت و خانەقاکەی هەروەک خۆی ماوەتەوە، بۆ خزمەت کردنی ئایینی ئیسلامی پیرۆز لە هەردوو ڕێبازی شەریعەت و تەریقەت، لە لایەن کورەزا گەورەکەی (جەنابی شێخ عبدالباسط نەقشبەندی)بەڕێوە دەچێ بنەماڵەکەشی کە ١٣ پشتە خزمەتی شەیعەت و تەریقەتی بە یەکەمی کردوە.

**درووود و سلاو بۆ گیانی پاک و بێ گەردی**



[illegible]
ئیسلامی و
نوسینەوەی
قورئانی پیرۆز

# گوڵبژێرێکی تری شاکارە دەست نوسیەکانی هونەرمەندی خۆشنوسی کورد شێخ (حامید ئامیدی)یە

## (١٨٩١-١٩٨٢ز)

*ئامادەکردنی : عەدنان حاجی کاکە*

هونەری خۆش نوسی یەکێکە لە بەشە گرنگ وشاکارەکانی هونەری تەشکیلی بۆیە هەر لە بەرەبەیانی مێژووی دێرین و هاوچەرخی هونەری زەغرەفەی دەست نوسی تایبینی کۆنی ئیسلامەوە: بەسەر رووبەری دەست نوسە مێژووییەکان و چوارچێوەی دەرگاو تەوێڵی زێڕینی منارەو گومەزی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی ئایین رەنگی داوەتەوە.

وا دەردەکەوێ کە هونەری ئەم هونەرەش بە مەبەستی نوسین وهەڵگرتن و پارێزگاری کردن و ئەرشیف کردنی دەست نوسی بەڵگەنامە کۆنەکانی مێژووی کۆن و هاوچەرخی کوردو ئیسلام بە کارهاتبێ لە کاتێکدا کە هێشتا چاپ و چاپخانەو چاپەمەنی پێشکەوتوی تەکنەلۆژی دانەهێنراوەو دواتر خۆش نوسی بۆتە بوارو قۆناغێکی تری هونەری فراوانتری تەشکیلی (مەختوت) سەبارەت بە رازاندنەوەو جوانکاری دەروازەو دیوارو تەوێڵی پیرۆزو بێ خەوشی مینبەرو منارەو گومەزی مزگەوتەکان... بێ شک میللەتی کوردیش لەم بوارەو قۆناغەدا ئەسپی رەسەنی کەلتورو کەلەپوری ئیسلامی خۆی تاوداوەو گەلێک هونەرمەندی خۆش نوسی ناوداری لەئامێزیا گۆش کردووە... یەکێک لەوانەش (مامۆستا حامیدی ئامیدی)ی هونەرمەندی خۆشنووس، یەکێکە لەو خۆش نووسە بەناوبانگانەی کە زۆربەی ژیان و تەمەنی لەگەڵ نوسین و خۆش نوسی دا بەسەربەدووە؛ ئەوەتا بەر لە مەرگی، خۆی گوتەنی: (زیاتر لە (٨٠) ساڵ تەمنم لەگەڵ نوسین و دەست نوس کردن و خۆش نوسیدا گوزەراندوە).

بەڵێ مامۆستای هونەرمەندی خوالێ خۆشبوو (حامید ئامێدی)؛ ناوی تەواوی خۆی (شێخ موسای کوڕی سەیدعەزمی کوڕی زولفەقار ئاغایە) و لە ساڵی (١٨٩١)ی زایینی لە شاری (دیاربەکر)ی کوردستانی ژوورو لە بنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەرو ئایینی چاوی بۆ ژیان کردۆتەوەو لە تەمەنی (٥) ساڵان دا خراوەتە بەر خوێندن و بۆیەکەم جار لە حوجرەی مزگەوتی گەوری (دیاربەکر) درێژەی بەخوێندنی شەریعەی ئیسلامی لە حەرفە ئەبجەدییەکانی ئایینی ئیسلامی پیرۆز داوەو هەر لەو شارەدا قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتای و ناوەندی و ئامادەیی تەواوکردووە، هەروەها لە ساڵی (١٩٠٦)دا بەمەبەستی درێژەدان بە خوێندن، دەچێتە (ئەستەمبوڵ) و لەوێ لە قوتابخانەی یاسا (مدرسة القضاة) وەرگیراوەو پاشان لە ساڵی (١٩٠٧)دا لە ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی تورکیا لە بەشی وێنەکێشان و زەنگوگراف لە شاری ئەستەمبوڵ وەردەگیرێت، بەڵام مەخابن بەهۆی کارەساتی دڵتەزێنی مەرگی باوکیەوە، ناتوانێت درێژە بەخوێندن بدات، بۆیە واز لەخوێندن دەهێنێ و دەبێتە مامۆستای خۆشنوسی و نیگارکێشان و لەیەکێ لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی ئەستەمبوڵ دا دەست دەکات بەوانە بێژی.





مامۆستا حامید ئامیدی خۆش نـوس لـه مـاوەی تەمـەنی وانـە بیژییـەتیدا توانـی سـەرکەوتنێکی ئیبداعـی هونـەری گـەورە بەدەسـت بهێنـێ، لەوانـە توانـی قوتابیـانی دەرەوەی قوتابخانەکـەی پـێ بگەیـەنێت کـە ئەوکاتـە وەک گوێگـر لـە (وانـە) کـەیدا، بەشـداریان دەکـرد یـەکێک لـەو قوتابیـە دەرچکیانـە (خۆش نوسـی بـەناوبانگی تورکیـا (حـەلیم ئۆزیـازیچی))بـوو کەلەسەردەسـتی مامۆستا حامید ئیجازەی خۆشنوسی پیدرا، ئینجا لە پاش سالێک وانـە بیـژی هونـەری دەسـت نـوس و نیگارکێشـی ، دەبیـت بـە (بەرێوەبـەری چاپخانـەی (الرســومات)لـە ئستەمبوڵ دواتر دەگوازرێتەوە چاپخانەی جەنگی عوسمانلی و لەجێگای مامۆستای خوالێ خۆش بوو (محەمـەد نـەزیف) ی خۆش نوس کە مامۆستای (ناوبراو) بوو بۆماوەی (٧) ساڵ دەست بەکاردەبێت، مامۆستا حامید ئامێدی لە ساڵی (١٩١٤)ی زایینی دا هاوکات لەگەڵ هەلایسانی جەنگی جیهانی یەکەم دەچێتە (ئـەلمانیا) و لە یەکێک لە چاپخانە هاوچەرخەکانی شاری (بەرلین)ی پایتـەختدا؛ دەسـت بـەکارکردن دەکـات و بۆمـاوەی چـەند سـالێک لـەوێ دەمێنێتـەوەو پاشـان دەگەرێتەوە تورکیاو لەگەڵ هەلبژاردنی ئەنجومـەنی نیشـتمانی تورکیـادا، بـە نوێنـەری شاری دیاربـەکر هـەڵدەبژێردرێ و دوای ماوەیـەکی کـەم دەکـرێ بـە قایمقـامی دیاربـەکر، دوای چـەند سـالێک (خانەنیشین) دەبێت و لـە ئەستـەمبوڵ لـە شـەقامی (بـاب العـالی) کـە بەشـەقامی رۆژنامـەوانان بەناوبانگـە ، نوسینگەیەکی خۆشنوسی دەکاتـەوەو دەست بـەکارکردن دەکات تا (مـەرگ) ئامێزی گـەرمی خۆی تێ وەردێنـێ و ماڵئـاوایی لەخاک و نیشتمان و گەلەکەی دەکات.

مامۆستای هونەرمەندی خوالێ خۆشبوو (حـامید ئـامێدی) لە ماوەی ژیان و تەمـەنی پرشکۆی هونـەریدا لەسـەر دەسـتی چەندین خۆشنوسی بەناوبانگی تورکیـا لەوانـە مامۆسـتایان (محەمەد نەزیف، حاجی احمد کامیل، عبدولسـەلام فـەندی، ئیسـماعیل حـەقی..) ئیجـازەی خـۆش نوسـی وەردەگـرێ، مامۆستا ئامێدی لەوماوەیەدا زۆر تابلۆی خۆش نوسی جوانی بەقەڵەمی هێڵکاری دەست و پەنجەی رەنگینی رەنگاندوە کە



بەشـێک لـە شـاکارە هونەریـەکانی لـە مۆزەخانـەکانی تورکیـاو جیهـانی دەرەوەدا، دانراوە، دیارە یەکێک لە هەرە شاکارە دەست نـوس و خـۆش نوسـیەکانی مامۆسـتا ، (نوسینەوەی قورئانی پیرۆز) بووە، کە بە خەتی (نوسخ) نوسراوەو زیاتر لـە چـەند جارێک لـەتورکیاو لەئـەلمانیا چـاپ کـراوە، کـە ئـەم بەرهەمـەش بـە جوانـترین و ئیبداعـترین شـاکارە مێژوییـە دەسـت نوسـە خـۆش نوسـیەکانی مامۆستای هونەرمـەند دەژمێـردرێ ئەمـە جگـە لـە دروست کردنـی نـەخش و نیگـارێکی زۆری زەغرەفـەیی بەسـەر رووی دەروازەو گومـەزی مزگـەوتـەکانی تورکیـاو میسـرو عێراقـەوە بـەلام جوانـترین و نایـاب تریـن نوسـین، نوسـینی سـورەتی (الفاتیحە) بوو کە بە خەتی (سولس) نوسیویەتی، مامۆستا حامیدی تەمەن زۆر قوتابی خۆشنوسی پـەروەردەکردوە لەوانـە (حەسەن چەلـەبی و ئەحمـەد فـاتیح، هاشـم محمد ، ئایاد حوسێن ، الراوی ، مامۆستا نەجات ئەنوەر هەولێری) و چەندانی تر..



مامۆسـتا حـامید، بـە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە توشی نەخۆشی شێرپەنجە دەبێت و لـە نەخۆشخانەی (حەیدەرپاشـا لـە تورکیا) لـە رۆژی ١٨/مایسـی/ ١٩٨٢ دا لـە تەمـەنی (٩١) سـالیدا دوا کـۆچ و ماڵئاوایی لە دنیای هونەرو رۆشنبیری گەلی کورد دەکات لە ئوستانی ئەسکەدار لە گۆرستانی (قەرەج ئەحمەد) بەخاک دەسپێردرێت. هەزاران سلاو لـە گیـانی پـاکی مامۆسـتای هونەرمەندی خۆش نوس (حامید ئامێدی) و هاورێ یانی ئەو رێبازە پیرۆزە...

- ... رۆحیان شاد و .... گۆریان پر نوور....


**سەرچاوەکان:**

- کتێبی ( **نشأة الخط العربي**) - محمود شوكر.
- کتێبی ( توێژینەوەی مێژووی هونەرو رۆشنبیری ئیسـلامی) تورکی / ساڵی/ ١٩٨٦.
- گۆڤاری (العربي) کوێت - ١٩٨٥.
- چـەند گۆڤـارو رۆژنامەیـەکی دیکـەی کـوردی و عـەرەبی و فارسی.
- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ساڵی / ١٩٨٢.



# داب و نەریتی فەقێیەتی لە کوردستاندا



مەلا عەبدولەتیف بامۆکی

**پێشەکی** : ئەم باسە وەک تۆژینەوەو لێکۆڵینەوە زۆری لەسەر نوسراوە و لە ئاستی بەرزدا گـفت و گۆی لەسەر کراوە، بەڵام لە ڕاستیدا یاسای فەقێیەتی یان ڕاستتر بڵێین یاسای خوێندن و نوسین وزانست و تۆمارکردنی کەلەپوری کورد بە ئەندازەی گرنگی نرخ و بەهای خۆی پێ نەدراوە، چونکەلە یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم یاسایە لەگەڵ سیستەمی خوێندنی نوێ دا هیچ بەرگری لە خۆی نەکرد و سەنگەری چۆڵ کرد بۆ یاسای ڕۆژئاواو بەبێ جەنگ و خوێن ڕشتن خۆی دا بەدەستەوە.

هەر چەندە کورد وەک نەتەوەیەکی بێ گـەن و سەروەری و سەربەخۆیی فەرمان ڕەوایی و ئاڵای تایبەت توانای نەبوو پارێزگاری لە داب و نەریتی ڕەسەنی خۆی بکات هەتا بو نەریتی خوێندن و نوسین دەست بگرێ بە ڕێبازی ڕەسەنی خۆی و موتوربەی بکات لە سیستەمی جیهانی یان هەر هیچ نەبێ پینەی کەم و کوریەکانی خۆی پێ بکات وەک تورک و عەرەب و فارس کردیان، ئەتوانم بە ڕاشکاوی بیڵێم ئێمە وەک کورد بوین بە ژێر هەرەسی دوشارە ستانی دژ بە یەک، بەڵام بۆ کورد هەم ئاهەنگ و هاورابوون، لەبەر ئەوە کورد لە ماوەی مێژوودا زۆر سودی لەم جۆرە خوێندنە وەرگرتووە و توانیویەتی لە ژێر ئەم دەوارەدا پارێزگاری لەبوونی خۆی و زمان و داب و نەریت، و زانا و دانای خۆی بکات و چاکترین حەشارگە بووە بۆ پاراستنی ئەدەب و مێژوو پەندی پێشینان و چیرۆک ئەفسانە و پاراستنی خوو ڕەوشتی کوردەواری، ئەگەر مەلا، قازی و مفتی و پێش نوێژ ووتار بێژی کورد لە کورد نەبوایە ئەو کاتە قەوارەی کارەساتی کورد بە ئازارترو کوشندەتر دەبوو لەبەر هێندە کە زۆر پێویستە ئەم جۆرە خوێندنە نرخ و بەهای زۆری بۆ دابنێین و بەناوی لاسایی و چاو لەسەر کەوتو کردن بە سووک تەماشای نەکەین و ڕەسەنایەتی و هاوچەرخی بکەینە تان و پۆی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا.

## ڕەگی یاسای فەقێیاتی

خۆش بەختانە کورد بە پێچەوانەی هەموو نەتەوەکانی ئاسیا بە شێوەی ڕێک کەوتن و سوڵح ئیسلامی وەرگرت و کورو کچ و خۆیان نەبوونە کۆیلە و بەندە و کارەکەر، و کەنیزەک وە لەوەش خۆشتر ئەوەبوو کە کوردیش پێش ئیسلام ژێر دەستەو و زۆر لێ کراوبوو و لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا ئازاری هەبوو بە دەست کاربەدەست و فرمان ڕەوای هەر دو ئیمپراتوریەتی فارس و ڕۆم یان ئێران و توران و کوردستان هەمیشە مەیدانی شەڕی خوێناوی و کاول کاری ئەم دو زل هێزە بوو سوتەمەنی هەموو شەڕەکان هەر کوردی داماو بوو کە ئیسلام هاتە لایان بوو بە نیعمەتی چاوەڕوان کراو و خواستی خەڵکی ڕەش و ڕوت و خواپەرست و ئاینی ئیسلام هیچ جۆرە ئەرک و ئازاری بۆ ئەم میللەتە نەهێنا، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو قەدەغەر کرد کەهیچ کەس بە هیچ جۆرە بیانویەک زەوی و ئەرز و ئاویان داگیر بکات و ساڵانە سەرڕاستانە خەرج و باجی زۆریان دەگەیاندە پایتەخت لە مەدینە، دیمشق، کوفە، بەغدا و خونکارو گەورە پیاوەکان و میرو سەرکۆمارەکان مەردانە پشوویەکی باشیان بە کورد ڕەوابینی و وازیان لە یارمەتی داگیرکردن هێنا و نەبوونە سوتەمەنی شەڕو خۆیان زۆر بە



دوور گرت لە کێشەو مل ملانێی فرمان رەوای و ئاژاوەی ئەمەوی و عەلەوی و عەباسی و کوردستان کە ئەو کاتە بە هەرێمی شاخاوی ناوبانگی دەرکردبوو لە ژیانێکی ئاسودەدا دەژیا و خەڵکەکەیان بە راستی و دروستی خزمەتی خۆیان و ئاینەکەیان دەکرد نەک هەر ئەوەندە بەڵکو خۆیان سەرگەرم کرد بەفێر بونی زمانی فرمان رەوا بەبێ ئەوەی زمانی خۆیان لە بیر بکەن یان فێر بوونی زمانی کوردی بکەنە ئەرک بۆ برا عەرەبەکان چونکە بە پێی فەرمانی قورئان ئەگەر کورد عەرەبی بزانێ دەبێ عەرەب خۆی فێری کوردی بکات بۆ ئەوەی ئاینەکەی پێ رابگەیەنێ. بەڵام کورد ئەو ئەرکەی خستە سەرشانی خۆی، ئەوەی گومانی تێدانی‌یە ئەوەیە کە کورد هەمیشە ئاشنا بووە لەگەڵ ئایین و بە پێی سەردەم هەرگیز ئایین نەبووە بۆ گۆڕینی ئایینی خۆی جڵەوی لە دەست ژێری خۆی بووە و هەمیشە زاناکانیان لەگەڵ میللەت و رەش و روتی نەتەوەکەیان بوون و هەرگیز رێک نەکەوتووە زانای کورد داردەستی داگیرکەرو بیانی بووبێت لەبەر ئەوە لەبەرەبەیانی خۆری ئیسلام لە سەرچاوگەوە و بۆ یەکەم جار نازانین کام فەقێ بوو لە کوردستان چووە دەرەوە خۆی فێری ئیسلام کرد و هاتەوە بۆ فێر کردنی نەتەوەکەی بەڵام وەک بۆمان دەردەکەوێ سەفەری ئیمامی شافعی لە تەمەنی چواردە ساڵی لە مەکەوە بۆ خزمەتی ئیمامی مالیک لە مەدینە سەرەتایی خوێندنی فەقێیاتی بێتو ئەو شێواز و رۆیشتن و ژیانەی ئیمامی شافعی سەرەتای خوێندنی فەقێیەتی کورد بێ کە لە ئیمامی شافعی‌یەوە دامەزراوە ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە ئەو جۆرە خوێندن و ژیان و گەڕان و بڕوانامەیە وەک خوێندنی فەقێیەکی لاوی زیرەکی، بەرەو وشتی، هەژاری ئەم کوردستانە دەچێت و پاش دانیشتنی و مەلایەتی و دەرس ووتنەوەی بکەین گەرماوگەرم لە یاسای فەقێ مەلای کوردستان دەچێت، خۆ ئەگەر زنجیرە ئیجازەنامەی مەلایەکی کورد تەماشابکەین هەموویان دەچێتەوە سەر ئەو کەڵەپیاوانەی مێژوو کە ئەوە ئەرکی زاناکانی ئەکادیمی یە کە بۆمانی بکەن و روونی بکەنەوە وەک سەردەم.

## مۆرکی کوردەواری بەیاساکەوە.

بێ گومان لەماوەی چواردەقەرنی ئیسلام لەکوردستان یاسای خوێندن ئاڵوگۆڕی بەسەرداهاتووەو توشی گۆڕانکاری و بەرزی و نزمی و لاوازی و گەشەکردن بووە، بەڵام ئەم جۆرە خوێندنە تایبەتە بە کوردو لە کورد جیانابێتەوە وەک نەخشی بەردی مەرمەڕ، کات و چەرخ ناتوانێ بیکوژێنێتەوەو کاڵی بکاتەوە لە هەموو تایبەت مەندیەکان بەهێز تر ئەوەیە چونکە کورد ئەمارەتی بووەو خاوەن ئیمپراتوریەت نەبووە، بناغەی یاساکە لەسەر ئەوە دانراوە کە فەقێ لەگەڵ میللەت بێت لەیەکەم قۆناغی ژیانی هەتا دەبێتە زاناو دانا جیانابێتەوەو لە هەموو خۆشی و ناخۆشی دا لەگەڵ هۆز و کۆمارو عەشیرەتی خۆیدابێو ئامۆژگاری و شەرع و فەتوا بەزمانی نەک هەر بەزمانی کوردیە بەڵکو بەزاراوەی ناوچەی خۆیەتی و بەزمانی کاربەدەست و حکومەتی ناوەندی قسەیان لەگەڵ ناکات و هەموو پێداویستی ژیان و خواردن و کتێب و پێخەف و شوێنی حەوانەوەیان لەگەڵ هۆزو رەوەندو هەوارگەدا گەرمیان و کوێستان دەکات و هەرشوێنێ ئاو و کانی تێدابێت جێگەکە کەپری فەقێ و حوجرەی مەلاو شوێنی پشوودان و حەوانەوەی پاڵەو کرێکارو وەرزێرەکانی کوردستانە، لەوەش بە هێزتر گەورەیی و شانازی ئەمیرەکانی کوردستان بە ماڵ و زێرو سامان نەبوو بەڵکو بەزۆری فەقێ و چاکی مەلا و زۆری کتێب خانەو خۆش گوزەرانی فەقێ کان بوو، قسەی خۆش و نوکتەی لەزەت و قسەی نەستەق هەمیشە شەوچەرەی حوجرەکانی فەقێ بوو و بەهەشتی مامۆستا سجادی چمکێکی کۆکردوەتەوە و لە فەوتان رزگاری کردوەو دەبێ زیاتر بکرێت.

ئەم جۆرە خوێندنە بۆ کورد چاکترین جۆری خوێندن بوو لە چەند سەرێکەوە کورد خۆی خۆی فێردەکردو رەوانەی گوندو شارۆچکەی دەکردو ئەوەی داهاتوو ئالاکەی لە ئەرزنەدەدا و بە ئەمانەتەوە بەدەستی ئەوەی دوای خۆی دەدا هەتا ئەمرۆ، ئەگەر بەهەڵەدا نەچوبم هەموو گەمەو یاری و وەرزشەکانی کوردەواری بەتایبەتی ئەوانەی بۆ بەهێزی بەژن و باڵا و لەش و لار و هزرو بیرکاریە هەموویان لە حوجرەی فەقێ وە وەرگرتووە چونکە یاسای



خوێندن وای داناوە سێ شەممەو هەینی وانە نەبووە هەردوشەو و هەردو ڕۆژ لە حەفتە بەیاری و گەمە و لەهۆی بەری و حەلال سەرف کردوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەش بزانین ئەگەر گرانی و قات و قڕی هەن و لیرە و تەنەکەو دینار بوبێت فەقێ هەمیشە تێروتەسەل و لەگەڵ سەرجەم خەڵکە کە ژیانیان باشتربون بە هۆی راتبەی فەقێ و دەقنەی فەقێ و پاشاو گزیرەوە.

## گرنگی پاسکە بۆ پێکەوە ژیانی زانایان

وەک ئاماژەم پێ کرد کورد دەزگای ناوەندی نەبووە کەمەڵبەندی گەورەی وەک نیشابور و بەغداو دیمەشق و ئەزهەر و زەیتونەو قەیرەوان دروست بکات بەڵکو بە قوتابخانەی سەرەکی میرەدێ کانی کوردستان درێژەی بە ئەم جۆرە خوێندنە داوەو لە راستی دا ئەرکی ئاینی و کۆمەلایەتی و گیانی و دەرونی و کۆمەلانی خەڵکی کوردستانی بە چاکی ئەنجام داوە، سەرچاوەکانی زانستی تەفسیریان بە چاکی لابووەو هەرچی راو بۆچونێک لەسەرانسەری جیهانی ئیسلامی دا روی داوە زانای کورد لێ ی بە ئاگابووە، بەلام ماوەی نەداوە عەوام و ساویلکە سەرگەرم بکات بە کێشەکانی قورس و ئالۆزەوە بەڵکو لە چوار چێوەی زانستی ناو مەلاومەلادە رنەچووە بەلام خەڵکی کوردستان لە وردو درشتی فقهی ئیسلامی شارەزا کردوەو چیانشینی کورستان ئاگاداری ووردەکاری فقهی ئیسلامی بووە وەک عبادەت و خواپەرستی، لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەم بە خاڵێکی زۆرگرنگ ئەویش ئەوەیە کورد زۆر شارەزایی زانستی عەرەبی و هەموو ئامیرەکانی نەحو، حورف، بلاغە/ئەدەبی عەرەبی بە تەنها بۆ ئەوەی کە سەرچاوەکانی زانیاری ئیسلامی هەموو عەرەبی یە لە قورئانەوە هەتا فەرمودەو فقە و مێژوو لەبەرئەوە گرنگی زۆری پێ داوە نەک لەبەرەئەوەی کە زمانی کوردی لا باش نەبووە چونکە ڕۆژانە مامۆستاکان دەرسەکانی عەرەبیان بە کوردی شەرح و راڤەکردوەو هەمیشە گرنگی دراوە بە خەت و نوسینی چونکە کتێب کەم بووە فەقێ مەجبور بووە بۆ هەر کتێب کە دەستی کردووە بە خوێندنی ڕۆژانە لەگەڵ خوێندن دا بە خەتێکی جوان و نەخش و نیگار و خاڵ بەندی بە هێز ئامادەی کردوە بە تایبەتی ((قید و تضبیب)) واتە بەیەکەوە بەستن و پینەکردنی ووشەکانی لەگەڵ هێڵکاری و پەراوێزو راڤەکردنی ووشە بەووشەو لێک دانەوەی ووشەکان و شی کردنەوەی **(اعراب)** کە لەیەکەم ڕۆژ کە دەستی کردووە بە عەرەبی لە ((ب) بسم اللە دەستی بە شی کردنەوە کردوەو هەمیشە جیاوازی هەبووە لە نێوان (( متن)) و (( شرح)) و (( حاشیە)) و ((نە)) کە هەریەکەیان واتەیەکی تایبەتی بەخشیوە، کەرەسەی ئەم جۆرە نوسینە تازەترین و چاکترین ((قەڵەم)) و (( مەرەکەب)) و کاغەز بووەو بەدەزووی باریک هێڵکاری و بەجزوبەینی رێک و پتەو خزمەتی کەلەپوری قەڵەم و خەت و نوسینی کوردیان پاراستووە. بەلام پرسیارێک دێتە سەرزار دوژمنان چۆن ماوەی کوردیان داوە کە پارێزگاری لەم داب و نەریتە بەکەڵک و سودوقازانجە بکات کە بە توندی و سەختی دوژمنایەتی بوونی کوردی کردوە تەنها وەلام ئەوەی فەقێ و مەلا بە هەزارویەک پەیوەندی لەگەڵ میللەت بووەو موچەخۆرو دەسەنە خۆرو جیرەخۆری بیانی نەبووەو بەنانە رەقە زانستی پەیداکردوە بەبێ پاداش و مزە بەخەڵکی گەیاندوەو بە هیچ شێوەیەک خۆی جیانەکردوەتەوە لە میللەتی خۆی، لەبەئەوە خۆشەویست و پارێزراو بووە.

## ژیانی زانیاری لە قوتابخانەکانی کوردستان

دکتۆر جواد ملا حمدأمین لە دەنگی زانای ژمارە (٢.١) دا بەم شێوە باسمان بۆ دەکات، گەلی کورد کە ئیسلامی وەرگرت پاش ماوەیەکی کورت لە هاتنی ئیسلام بە دڵسۆزی یەوە کەوتە خزمەتی بیروباوەڕی ئیسلام و ئیسلامی کردە سلوک و دەستوری ژیانی ... لە هەموو کوردستان مزگەوتی دروستکرد نەک هەر لەشارەکان بەڵکو لە گوندو لادێ کان و ئەم شوێنانە بوونە مەڵبەندی رۆشنبیری و زانستی. کە هەموو کوردستانی گرتەوەو لە سەدەی (دوو) و (سێ)ی کۆچی هەتا ئێستا ماوە مزگەوتەکان ـ بۆماوەیەکی زۆر ـ تاکە جێگەی ئەڵقەی دەرس خوێندن بووە.

ئەم قوتابخانە ئەرکی گرنگی یان گێڕا بۆ پاراستنی کەلەپوری ئیسلامی و بلاوکردنەوەی رۆشنبیری و لە کوردستانیشدا زۆر بنەماڵەی زانستی و زانیاری رەسەن خزمەتیان بە ئیسلام کرد بۆ ماوەی درێژخایەن و لە ماڵەکانیان دا کەلەپیاوی گەورە هەڵکەوت لە ساڵی



١٠٦٥ (ئولیا چەلەبی) باس لەمزگەوتی دیاربەکر دەکات کە هەشتا ئەڵقەی دەرس هەبووە لەیەک کات داو لە ساڵانی ١٢٤٢ کۆچی میری رواندز بە هەمووتواناوە یارمەتی فەقێ و زانای کوردی داوە.

بێگومان ئەوەی دکتۆر باسی دەکات وەک تواترو اجماعی لێ هاتووەو هەموو کەس کە کۆلکە خوێندەواریەکی هەبوبێت لە کوردستان دا لە رێگەی مزگەوت و قوتابخانەی مزگەوتەوە دەستی کەوتووە هەتا دامەزراندنی قوتابخانەکانی حکومی کە بەراستی گەشەکردنی خوێندنی هاوچەرخی تازە جێگەی خوێندنی فەقیەتی تەنگ کردو لە ئەنجام دا لاوازی کرد، بەڵام جیاوازیەکی زۆر گرنگ هەبوو لە نێوان فەقیەتی و سیستەمی خوێندنی تازە لەوانە خوێندنی فەقێیەتی سنوری نەبوو و لە هەموو کوردستان هەبوو سنووری دەست کرد نەیتوانی فەقێی ئیران و عیراق و تورکیا و سوریا لەیەک جیابکاتەوەو بەم کارەش پەیوەندی نەتەوایەتی و ئاڵوگۆری رۆشنبیری و ئەدەب وشیعر و داب و نەریتی کوردستان وەک هەنگوینی هەنگی کوێستان لە هەموو گوڵێکی کوردستان دروست دەبوو و لەکاتێک دا کە دەنگ و باسی زۆر درەنگ بڵاو دەبووەوە، بەڵام فەقێ وەک پەیک و تەقەر و باڵندەی گەرمیان و کوێستان بە گەرماوگەرمی هەواڵەکانی دەگەیاندە هەموو پارچەکان و لەوەش گرنگ تر زۆربەی زاناکان هەریەکە لە بەشێک شارەزایی و پسپۆری هەبوو، لەبەرئەوە فەقێ وەک پەیرەوی امامی شافعی بۆ هەر زانستێک زانایەک هەڵدەبژێرێ و راوبۆچوونی زۆرترین زانا کۆدەکاتەوەو تەنها لەیەک سەرچاوە خۆی تێناکات، ئەمەو پەیوەندی گیانی و کۆمەڵایەتی پارچەکانی کوردستان کە دوژمن لەیەکی ترازاندبوو پارێزراو بوو لەم رێگەوە.

## زاراوەکانی یاسای فەقیەتی

لەراستی دا شێوەی قوتابخانەی ئاینی کوردستان دەگەرێتەوە بۆ کاتی سەعادەت لەیەکەم سەرکەوتنی پێغەمبەر ((د.خ)) بەسەر قورەیشەکان کە هەردیلێک چەند قوتابییەک فێری خوێندن بکات و لەکاتی خەلافەتی پێشەوایی موسڵمانان عومەری کوری خەتاب کە مامۆستای دامەزراند بۆ فێرکردنی قوتابی لە تەمەنی حەوت ساڵەوە یەکەم جار لەیەک پەرەکاغەز هەموو حەرفەکان دەنوسرێ و قوتابی بە ووشەی ((یاالله، یا فتاح، یا رزاق)) دەست پێ دەکات و حروفی هجای عەرەبی کە لە ئەلف ، بێ ، تێ دەست پێ دەکات بە شێوەی ((ا، ب،ت ،... هەتا لای )).

پاش چەند هەفتەیە بە خوێندن و نوسینی لەسەر ئەم حەرفانە قوتابی فێری شێوەی حەرف دەبێت بە خوێندن و نوسین پاش ئەوە یەکەم دەستەواژە ئەم رستەی خوارەوە فێردەبێ بە شێوەی حونجەو سایە (( **أعوذ بالله ...**)) و یەکەم ئایەتی قورئانی پیرۆز کە (( **بسم الله الرحمن الرحیم**)) فێردەبێ و لە سورەتی بچوک دەست پێ دەکات پاش ئەوە هەندێ کتێبی فارسی و عەقیدەی کوردی کە بە هەمووی سێ ساڵ دەخایەنێ و لە نێوان ماڵی باوک خێزان و قوتابخانە رۆژانە دەرس دەخوێنێ. لێرەدا هێچ مەرجێک نیە بۆ خوێندن جگە لە زیرەکی و هەندێ یارمەتی مامۆستای قوتابیان بە شێوەی رەمزی و کەس و کاری قوتابی ئیش و کاری پێ نەکەن هەتا گیرە ووشەی قوتابی نازناوی ئەم پلەیە بنج ویێتوانی ووشە کە لە کتابی یەوە هاتووە واتەی شاگردی قوتابخانەیە لە پاش ئەوە لە تەمەنی(١٠) ساڵی دەچێتە حوجرە و ناوی ((سوختە))ی لێ دەنێن و ووشەکەبەفارسی دانراوەومانای سوتاوی خوێندن و خزمەت کردن دەگەیەنێ، چونکە ئیش و کاری راتبە، چای لێنان، گسک دان و خزمەت کردنی مامۆستاکەیەتی لەگەڵ خوێندن واتە دوکاری سەخت و دژوارو مانای سەخت دەگەیەنی و دورنییە لەش و بار سوک بگەیەنێ چونکە هەمیشە سوک و سوڵ وئامادەیە.

پلەی سێ یەم (( مستعدە)) واتە لە خەم دەرچووەو لای مامۆستای گەورە دەرس دەخوێنێ و ئامادەی فێکردنی سوختەو خۆشی فێردەکات لای مامۆستای گەورە ئەوەش ماوەی دەساڵ دەخایەتی بە مانای ئەوە کە (مستعد) گەیشتە بیست ساڵ ئەو کاتە ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و شایستەیە کە ببێتە مەلاو لە مزگەوتی سەرخودا ببێتە ئیمام و مامۆستای فەقێ یان. ووشەی مەلا گەلێ جار مانای کراوە و بۆچونی



جیاواز هەیە: مەلا لە ووشەی (مـلآ) هاتووە و بە مانای پڕ لەزانست یان (تلأ)ەوە هاتووە مانای کۆمەڵ و ئاپورەو قەڵەباڵغ کە مانای ئەوەیە لە ناو جەماوەردا مافی گفت و گۆو ئامۆژگاری هەیەو وتەبێژی کۆڕو کۆمەڵ و ناو گەل و حوزرو مزگەوتە.

## ژیانەوەی یاسای فەقێیەتی لەکوردستان

پاش ڕاپەرینی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەدەست پێش کاری وەزارەتی ئەوقافو کاروباری ئیسلامی ئەو یاسایە زیندوکراوەتەوەو لەسەرانسەری کوردستان زیاتر لە بیست قوتابخانە بەیاسای ئەڵقەو بەگوێرەی خوێندنی پێشوو بە هەمان بەرنامەو کتێب و ڕێبازی خوێندن لە پۆلی یەکەمی ناوەندی هەتا سێ یەم و لە چوارەوە هەتا شەشەمی ئامادەیی و لەپلەی سێ یەم بەیانگەی پێش نوێژ و وتاربێژو بەژمارەی زیاتر لە حەوت سەد قوتابی دەخوێنێ.

## کورتەی باسەکەمان

ئەم باسە گەلێ لایەنی شاراوەو نهێنی ماوەو زۆربەی ئەوانەی کە لە سەر ئەم باسەیان نوسیوە زۆربەکورتی وبە کوردی ئاماژەیان بۆ کردوە بەلاّم من دەمەوێ بۆ زیاتر توێژینەوە ئەم سەرباسانە شی بکەمەوە، ڕێگەی دەرس وتنەوە، شێوازی هەڵس و کەوتی قوتابی لەگەڵ سوختەو هەتا دووایی، لایەنە تاریکەکانی ئەم دابونەریتە، کتێب و پەڕاوە دیاریکراوەکانی قۆناغەکان، سامانی بە نرخی دەست نوسەکانی کوردستان کە بەری ڕەنجی دەیان هەزار زاناو داناو خۆشنوسی کوردستانە، چارەسەری کێشەکانی خوێندنی ئاینی و گرێ دانی بە خوێندنی هاوچەرخەوە.

بۆ ئەم باسە سودم وەرگرتووە لە نوسینی بەنرخی دکتۆر جواد ملا حمد أمین لە دەنگی زانای ژمارە ( ١. هەتا ٥ ) ) کە بەڕاستی توێژینەوەی زانستانە و ئەکادیمی ئەنجام داوەو سودی لە دەیان سەرچاوە وەرگرتووە، ئەگەر بتوانرێ مێژووی بنەماڵەکانی زانستی بلاوبکەینەوە چاکترین خزمەتمان کردوە بەکوردو مێژوی کوردستان.

لە کۆتایی باسەکەدا باسی ڕۆڵی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم کە دەستی کەرەم و پیاوەتی زۆری هەیە لە بوژانەوەو ڕاست کردنەوەو بەسەرکردنەوەی ئەو شێوازە خوێندنەی کوردستان، ئەرکی مەلای کورد لەم بوارەدا ئەگەر خوایاریێ ئەم ئەرکە ئەنجام بدەم هەست بەخۆشی و بەختەوەری و ئەنجامی واجبم داوە.

## ڕێگاکانی دەرس وتنەوەی فەقێ

ڕێگەی وانە وتنەوە ئێستە زۆرگۆڕاوەو هۆی ڕون کردنەوەی دەنگو ڕەنگ و لەوحەو سەبورەو نوسین و هێڵ کاری و ڕاهێنان و پرسیارو وەلاّم و نرخاندنی پرسیار لە ناوکتێبەکاندا هەیە بەلاّم لەیاسای فەقێیان هەموو بەیانی دووای نوێژی بەیانی مامۆستای گەورە دێتە حوجرەی خۆی و حوجرەکەش لەسەر فەرش دادەنیشن و بە هاوین فێنک و بەزستان گەرم و هەموو فەقێکان لە دەوری مامۆستا لەسەر چۆک و ئەژنۆ دادەنیشن و یەک کەس بەڵێ دەکات و ئەوانی دی بەس گوێ دەگرن،مامۆستا دەقی وانەکە دەخوێنێتەوەو هەر بەخوێندنەوەکەی هەندێ کێشەی فەقێ چارەدەکات و دەست دەکات بە شەرح کردن ئەگەر هەردەرسێک بێت بەکوردی پەتی شەرحی دەکاو فەقێ مافی پرسیاری هەیە هەتا سنوری نارەحەت کردنی مامۆستاکەی، بۆ ئەوەی شەو **مطالعە** ی دەرسەکە بکات و بە ئامادەیی دەرس بلێتەوەو بە شێوازی (القاء) دەرسەکە ڕاڤەدەکات ونمونەی جۆراوجۆر بۆ تێگەیاندن و تێگەیشتن بۆ فەقێ دەهێنێتەوە، هەنێ جار بەڕێبازی تاقی کردنەوەو هەڵە و هەندێ بە شێوازی ((ئاداب و **بحث و مناظرة**)) و لە ڕێگەی (( **منح ونقض و معارضة** ))و ڕەدو بەدەل دەرسەکە دەبەستێتەوە بە هەموو زانستەکانەوە بە تایبەتی **منطق و مناظرە و بەحثە** وە .

پاش دەرس خوێندن دووبارە فەقێ بۆ خۆیان ((پێدادەچنەوە)) و پاش ماوەیەک ئەوانیش بە دەرس بەخواری خۆیان دەڵێنەوە و بەشێوەی ((توليف، تركيب، استقراء، سبروغور، تحليل، تعريف)) دەرسەکە سەروبن و شەن و کەو دەکەن پاش ئەوە مەتنی کتێبەکە لەبەردەکەن و شەوانە دەوری دەکەنەوە بەشێوەی پەلو هەندێ جار



((ئەلێ بابەکەم)) دووبارە دەکەنەوەو هەندێ جار بۆخەت خۆشی کتێبەکە دەنوسنەوە کە تەواو بوو کاکی فەقێ دەبێتە خاوەن کتێبی خۆی، خەتی خۆش دەبێ و رەسم **الخط** فێر دەبێ و هەڵەکانی خۆی لە کاتی دەرس خوێندن بە پەراوێز نەخش دەکات و زۆر جار تأریخ و کارەسات و رووداو مردن و لە دایک بوون تۆمار دەکات لەبەر ئەوە دەست نوسەکانی کوردستان بە شێکی لە مێژووی کوردوکوردستان شەوانی سێ شەممەو هەینی دەبێتە مجادەلەو پرسیار و کۆنە قەید و معماو لوغزو **صیغة شكل** لەناویان زۆر باوە بەراستی بەو شێوازە فەقێ رۆژانەی لە تاقی کردنەوەو ئەزموندایەو لەسەروی هەمویان مامۆستای گەورەو مستعدە.

## شێوازی هەڵس و کەوت

ئەگەر بڵێم ئەو ئەدەب و رێز و حورمەتەی لەناو فەقێ و مەلادا هەیە لە ناو هیچ توێژ و چین و کۆمەڵێک دانیە، لەبەر هەڵسان، دەست ماچ کردن، پێڵاو دانانو لەسەر چوکا دانیشتن، دەنگ بەرزنەکردنەوە، رۆیشتن لە رێگە بە گوێرەی تەمەن زانست، قۆنەخ رەچاو دەکرێ لەیەک هەنگاوی خوێندنەوە دەست پێ دەکات قوتابی بۆ سوختە، سوختە بۆ مستعد، مستعد بۆ مامۆستا، مامۆستا بۆ لە خۆی گەورەتر و لە دانیشتن و نان خواردن دا بەو شێوەیەکە هەموو خۆش تر باسایی دابەش کردۆتەوە((پاش دابەش کردن بە ئەندازەیی ئەوانە کە لەو هەیە دوکوس دەودەکەن هەمیشە دەهەیە و هەردولا چەند پەنجە درێژ بکەن ئەوەند ژمارە دەکەن لەو کەسەوە کە دەویی لێ بوو و بە شێوەی دادپەروەرانە هەر کەسێ بەشی خۆی دەبا.

## لایەنە گەش و چاکەکان

. لەیەکەم وشەی ئەم وتارە تەنها قسەمان لەسەر چاکەکردوە و دوبارەیی ناکەینەوە تەنها ئەوە نەبێ کە خوێندنی فەقێ بۆ کردنەوەیی مێشک و هزر و بیر و راو وپژاندنی زمانی ئاخاوتن و دانوستان و گفتوگۆو گوێ گرتن و رەخنە گرتن و هەڵوەشانەوەی بۆچونی هەموو کەس جگە لە قورئان و فەرموودە و ئیجتماع کە ئەوانە قابلی هەڵوەشاندنەوە ناکات و لەگەڵ ئەوەش فەقێ فێری چاونەترسی و ورئەتی ئەدەبی ووتاری کوت و پڕ و دژ و دژی دژ دەبێ و فێری وتاربێژی و شەرم و تەریق بونەوە زۆر کەم دەبێت لەلایی فەقێوە.

## لایەنە تاریک و نامۆکان

رەنگە ئێمە یەکەم کەس نەبین کە باسی لایەنە خراپ و تاریکەکانی ئەم نەریتە بکەین، چونکە پاش روخاندنی خەلافەتی بەناو ئیسلامی عوسمانی دوژمنانی ئیسلام و کورد هەرچی رق و کینە وخاوی و دڵی رەشیان هەبوو بە ئاشکراو بێ پێچ و پەنهانی و بەکردەوە بەسەر مەلا و فەقێ و سیستەمی خوێندنیان دەرشت و ژەهری ماری تۆڵەیان لەلاشەی ئەو قۆناغانەو بنەماڵە و زاناوناودارانە دەکرد کە کوێرانە دوای قەلەرەشی شارستانی مادی نەکەوتن پاش یەک سەدە بۆیان دەرکەوت کە دوای سەراب کەوتوون و ئەو بریق و باقە ناو نییە، بەڵام کەیاسای فەقێیاتی لاوازبوو مەلا لە گۆڕەپانی دەرس وخوێندن دوور کەوتەوە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە کەم و کوری نەبووە، لە هەمووی نامۆ تروخراپ تر ئەوەیە کەهەندێ مەلای نامەلاو دوور لە زانست و خاڵی لەرۆشنبیری و بنەماکانی زانستە شەرعی یەکان بەجلوبەرگی مەلایەتی بوونە هۆی ئەوەی کە خوێندەوارە تازە لاوو گەنجەکانی کورد بەنەزانین و بێ ئاگای و ناشارەزایی و گێرانەوەی بۆچونی ئەفسانەو ئیسرائیلی و دورخستنەوەی کورد لە زانستی سەردەم وەک بیرکاری و مێژوو و جوگرافی و فیزیکو کیمیاو گشت زانیاریە بەنرخەکان کە شیلەی مێشک و هزری سەرجەم هەموو مرۆڤایەتی یە بە موسڵمانیشەوە دەست نیشان بکەن.

بەڵام لەبەر ئەوە کاتی خۆی ژیان و گوزەرانی فەقێ لەسەر خەڵکانی کوردبووە و کورد کیانی نەبووە کە چاودێری ئەم جۆرە خوێندنە بکات وەکو فارسەکان و شیعەکانی باشوور سەدەقەو زەکات و لەسەدا چواری داهات نەدراوە بە (( حەوزە)) کورد توانای نەبووە ئەم سیستەمە بپارێزێ، بەڵام ئێستە کورد حکومەتی هەیە



...ایبەت لەرێگەی قوتابخانەکانی ئەوقافەوە هەر زانـاو ...لایە ...رجی ... ستی تێدا نەبێ بە پێش نوێژ و وانەبێژو ...اربێژ دا...رێ و ئێمەش وەک خواپێداوان ئەرکی ئاینی خۆمان لەلایەن زانای هوشیاری خۆمانەوە ئەنجام بدەین لایەنێکی تری ئەم نەریتە ئەوەیە زیاتر خۆیـان خەریک ناکەن بـۆ زانسـت و زانیـاری و بنـەڕەت و بنـەماکانی زانیاریەکان فێربـن، بەڵکو تـەنها ((کتێب)) فێردەبن و هەموو کتێبەکانیش بەڕاستی ئەوەندە شرح وشەرحی شەرح و حاشیەی لەسەر کراوە وەک (( بلاتشبیهە )) عەربانـەی جـەژنانی لـێ هـاتوە و زانیـاری زۆر ـه زەحمـەت لـێ وەردەگـیرێ لەڕاسـتی دا وەزارەتـی ئـەوقاف کـە هـەندێ کتێبی بـەنرخی دیاری کردوە ئەگەر بەشێوازی چاپی هاو چەرخ وتێژینەوەی سەردەم چـاپ بکرێ گـەلێ سودو نرخی زیاتر دەبێ، لایەنێکی تری خراپی ئەم نەریتە ئەوەیە زۆر خۆیـان بە دور دەگرت لـە زانسـتی سـەردەم بـەڵام خـۆش بەختانە وەزارەتی ئەوقاف هەمووزانستە سەردەمەکانی لە چوارچێوەی زانسـتی فـەقێیاتی جێگــە کردوەتـەوە بـەم کـارەش ڕەسـەنایەتی یاسـای کۆنـی کـوردو کەلـەپوری خوێندنمان لەگەڵ سەردەم وکات و چەرخدا کراوە تانوو پۆی کالایەکی نەو باوی کورد، لەبەرئەوە ئەرکی مـەلای کوردە لە ئەمڕۆی کوردستان دا لە سەنگەری مزگەوتو میحراب وقوتابخانەکانی ئیسلامی کوردستانەوە خزمـەت بـەکوردو ئیسلام بکەن نە ئەوەندە ووشک و نەگونجاو لەگەڵ ڕەونـی شارستانی و پێشکەوتنی زانستی و نە ئەوەندە دوژمن بە کەلەپور و شانازی نەتەوەو سامانی دێرین و شوێن کەوتنی هەر دەنگێـک و ڕێبـازێک کە بە تـاقی کردنـەوە شکسـتی هێناوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بکەم بەڕاستی یەکی زۆر تفت و تاڵ و پڕ لـە ئاسۆر و ژان ئـەوەش ئەوەیە زۆر لاوی خوێـن گـەرم و دڵسـۆزی کـورد و ئیسـلام بـە هەناسـەی کـورت و زۆر بـە پەلــە و لــە ئـەنجامی هـەندێ تەوژمی پەڕگروتوندڕەو و لاگر هەموو دوواکەتن وبـێ دادی و کـەمو کـوڕی کۆمەڵگـەی کـوردەواری دەخاتـە ئەسـتۆی مــەلاو فــەقێ و شــابالەکانی پیلانــی ((اســتعمار و استشراف و داگیرکاران فەرامۆش دەکـات و لـەناو خـەڵک و نوێژ کـەر و هـاتو چۆکـەرانی مزگەوتـەکان و لەسـەر بـۆ چونێکی (فقـه))ی کـە زانایـان ڕۆژانـە دەیـان قـال وقیلـی وایان بـەدەرس وتۆتـەوە و پشـت گوێیـان خسـتووە، چونکـە لەگـەڵ سـۆزو ژیـری و فـامی کـورددا نـاگونجێ دەکەونـە تانەوتەشەرو غەیبەتی زانایان کە بەڕاستی گۆشتیان تاڵـەو ژەهری کوشندەی موسڵمانە، بۆیە زۆر بـە پەسـەندی دەزانم بزافە ڕەسەن و تێکۆشەرانی ڕێبازی ئیسلامی و هۆشیاری ئایینی هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاری زانایان بدەن نەوەک جێگەیان پێ لەق بکەین و خەڵکانی ناشارەزاو بێ تەقوا لە شوێنەکانیان بچەقێنین، بەڕاستی بۆ کورد جگەلـە مەلاو فەقێ کەس توانای نی یـە ڕابەرایەتی بـۆ چونـەکانی فقهی ئیسـلامی بکـات چونکـە ئـەم بەرێزانـە بەشـیرەوە خواردویانـەو ئـەم ئاینـە لەسـەر دەسـتی ئـەوان گەیشـتوەتە دەستی ئێمەو لەسەر دەستی ئەوان گەشە دەکات، زریـان و گەردەلولی دەرەوە بۆناو کوردستان کاتی یە و کەف و کوڵـە هێنـدە نـی یە کەکۆشکی پڕ لــە شـکۆی ئیسـلام و کـورد بروخێنی بەڵگـەم دوژمنکـاری ڕژێمـەکانی شـای ئێـران و کەمالیەکان کە نەیان توانی مەلای کورد لە جەماوەرەکەی دوربخەنـەوە شـاعری عرفـان و خواناسـی کـورد مەولـەوی دەفەرموێ ((هەر عەمارەتێ حەزکەی باقی بو ئاو مەی، خاک خڵتە بەناش ساقی بۆ)) ڕاستە ئەم دینـە لـە مـەلاوە گەیشـتووە هـەردەبێ مـەلاو فـەقێ گەشـەی پـێ بـدەن، زۆر بەڕاستی دەزانم لەسـەر ئـەم گۆڤـارە نۆبەرەیـە، ئـەم گوڵـە مێخەکـەی کوردسـتان، ئـەم خـۆرە گەرمـە و بەتینـەو گیـان بزوێنەدا وا لـە زانکـۆو کۆلیـژە پـەیوەندارەکانی هـەرێمی کوردستان بکـەم کە درەختی پـڕ بەرەکـەتی بەرهـەم داری کوردستان ئـاودێر بکـەن و ئاسـتەنگ لەرێگـەیدا لادەن و بەهـەموو تواناوە نرخـی زانسـتی نـەریتی فـەقێیاتی لـە کۆشی پڕ لە میهرو خۆشەویستی دا بحەوێننەوە، بەگـەرمی بـانگی هـەموو مـەلاو زاناکـانی کوردسـتان دەکـەم کـە بەڕاستی و لەسەرچاوەی باوەڕپێ کراوەکانەوە ئیسلام بـە کـورد بگەیـەنن و لایەنـە گەشـاوەکانی قوتابخانــەکانی کوردسـتان بـەبیرەوەری و تاقیکردنـەوەکانی خۆیـان زیـاتر تۆمـار بکـەن و لەسـەر بنەماڵـە زانستیەکان و نـاوداران و کەڵـەپیاوانی گەلەکـەمان بکەنـە مـادەی وتـارو گفتوگۆیـان لـەناو جـەماوەردا، قوتابخانـەکانی هـەولێرو سـلێمانی و سۆران و بادینان و کتێبخانەکانی بیارەو شێخ مارفی نودێ و بنەماڵەکانی زانستی کوردستان بەخـەڵک ئاشنا بکـەن، وەک بـە زیندویی خزمـەتی کوردیـان کردوە پـاش مردنیـان روحیان شادبکەن و شـاد ڕەوان بن.



# ئیسلام و نەتەوە



**دلێر عەونی**

میللەتی کورد موسڵمانەو پابەندی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە هەر ئەو ئایینەشە وای کردووە کە مرۆڤی کورد دڵسۆزی خاک و گەل و نیشتمان بێ بۆ ئەوەی بە ئاسودەیی و کامەرانی ژیانی بەختەوەر بێ.

کوردی موسڵمان دەبێ خۆی وگەلەکەی و نیستمانەکەی لە پێش هەموو نەتەودو گەل و وڵاتێکی غەیرە کورد دابنێ بۆ ئەوەی بەهەشتی بەرین بۆ خۆی مسۆگەر بکات چونکە خوای گەورە و میهرەبان چەندین گەل و تیرە و هۆزی داناوە هەتاکو لە بەینی یەکتر بە ئاشتی و ئاسودەیی بژین.

مرۆڤی کورد هەموو دەم ئامادەبودو ئامادەبە خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بکات خوێنیان تێکەڵ بە گەلانی تریوە بۆ خزمەتی ئەو ئایینە پیرۆزە چەندین شوێنی پیرۆزیان لەدەست کافران رزگار کردووە هەروەکو سەلاحەدینی ئەیوبی و مێژوش ئەو بەڵگەیە دەسەلمێنێ.

ئێمەی کوردی موسڵمان چۆن بە هانای مەسڵمانی غەیرە کورد چوین، لەسەر ئەوانیش پێویستە هەر لە روانگەی ((المسلم اخو المسلم)) لەو رۆژە سەختانە بێن بە هانای ئێمەوە تاکو کوردی موسڵمانیش بە ئامانج و ئاواتی خۆی بگات نەک بە دانانەوەی داو و تەڵەو موئامەرە کردن لەسەری، ئەمرۆکە لەو بارودۆخەی کە میللەتی کوردی تێکەوتوە دەبێ و ئیشی هەموو کۆمەڵان و جەماوەری خەڵکی بەشەرەفی کوردستانە شان بە شانی یەک و دەست لەناو دەست هەموو پارتە سیاسی و ئیسلامییەکان بۆ خزمەت کردنی گەل بۆ ئەوەی بە یەکجاری رزگاری ببێ لەم گێژاوەی کە تێی کەوتوە ئەمەش کاری دڵسۆزان و خەم خۆرانی گەل و وڵاتە.

ئەمرۆکە سەردەم سەردەمی مافی مرۆڤە ودکوردیش داوای مافی خۆی ددکات بۆ ئەوەی چارەنوسی دیار بێت و بە هەزاران شەهیدی داود، ناحەزانی کورد لە دەوڵەتەکانی ئەو ناوچەیە بۆ بەرژەوەندی خۆیان کورد جینوسەید دەکەن یان بە جودا خوازی حساب دەکەن یان بە تیرۆریست و نەوەی شەیتان ناویان ددبەن.

دەبێ وڵاتانی دەوروبەر بێنە قەناعەت کە مافی چارەی خۆنوسین هیچ زیانی نیە بۆ ئەوان و نابێ وای پیشان بدەن و بیر بکەنەوە کە ئەو داوایەی میللەتی کورد هیچ مەترسی نیە لەسەر رەوتی سیاسی ئەو دەوڵەتانە.

مامۆستایان و پیاوانی ئایینی رۆڵی زۆر گەورەیان هەبوە هەر لە شۆڕشی شێخ محمود و شێخ سەعیدی پیران و قازی محمد تا دەگاتە شۆڕشی ئەیلولی مەزن خوالێ خۆشبوو بارزانیی نەمر رابەرایەتی دەکرد چەندین شێخ و مەلا لەسەردوە بە جلی شێخایەتی مەلایەتی لە ژێریشەوە بە رانک و چۆغەی کوردی و بە تفەنگ و فیشەک دانەوەو بەرگریان لە شەرەف و کەرامەتی میللەتەکەیان کردوەو مێشکی رۆڵەی کوردیان بە هەستی نەتەوایەتی ئاو داوەو بوونەتە پێشەنگ بۆ ئەم شۆڕشانە. بۆیە دەبێ بە هەمو لایەک نەتەوەکەمان سەرخەین وچونکە ئاسۆیەکی رون چاوەڕوانە، ئەوەتا سەرۆکی هێژامان سەرۆک بارزانی دەفەرمێ و دەڵێ ((من حزبی نیم بەڵام نەتەوەیم)).

ئەو دەسکەوتە مەزنەی ئەمرۆکە کە بەدەستمان هێناوە لە پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان پێویستی بە پاراستن هەیە و نابێ رێگە بە هیچ حزب و لایەنێک بدرێ کە ئەم کیانە جێ لەق بکا و تێکی بدات یان دەوڵەتانی ئیقلیمی بە هەودسی خۆیان تەراتێنی تێدا بکەن بە بیانوی ئەوەی کە ئەم حکومەتە ترسناکە لەسەر رەوشی ئەمنی قەومی ئەوان.

خوای گەورە و میهرەبان داوای یەک گرتن و برایەتی و تەباییمان لێ دەکات هەر بەیەک گرتن و برایەتیە هیواکانما چرۆ دەکەن و خەونی دوژمنانمان دێنێتە گۆڕ.

نابێ کێشەو گرفت بۆ ئەم میللەتە هەژارە دروست بکەین لە ژێر هەر برو بیانویەک بێت ئەبێ هەمومان بە یەک ریز برینەکان سارێژ بکەین و خزمەتی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم بکەین و چیتر تەنگژەی بۆ دروست نەکەین.



شێکی زۆری
کۆنەردودو دیرۆکنووسان
سەر ئەوە کۆکن، کە
ی سەردکی بە ئاشتی
ن بوونی کورد بۆ
: ددگەڕێتەوە کە کورد
ک گەلانی تر بێت
ست و(وەسەنی) نەبووە
ن ئاینی تایبەتی خۆی
: کە زەردەشتیە، هەرچەندە تانهۆژی ددمە تەقێ و
تەومر لەسەر ئەوە هەیە کە ئایا زەردەشتی ئاینێکی
نی بووە یا نا؛ بەڵام هەر چۆنێک بێت. زەردەشتی
نێکی یەکتاپەرستی بووەو باوەڕی بە حیسابی ڕۆژی
هی ((قیامەت)) هەبووە، بۆیە دژەکاری و (تناقچ)ێکی
تۆ نەبووە لە نێوان زەردەشتی و ئاینی نوێدا ((ئیسلام))،
مانایەکی دی تاکی کوردی ئاینی نوێ لە لانامۆ نەبووە تا
هەڵستی و دژایەتی بکات، ئەمە جگە ئەوەی میللەتی
کورد بە ئیسلام بوونی، هەستی بە زوڵم و زۆری
یەکسانیەکی ئەوتۆ نەکردووە تا لێی بڕەوێتەوە، بۆیە بە
گیانێکی خۆنەویستانەو لە خۆ بردووانە بەرگری و بەرەڤانی لە
ئیسلامەتی کردو هەوڵی بلاڤبوونەوەشی دا...

دیارە دەکرێ بڵێین ئیسلام ئاینێکی جیهانی و
ئەنترناسینالیستیەو تایبەت نیە بەگەل و نەتەوەیەکی
دیاریکراو، بۆیە لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەریش (د.خ) گەلێک
کەسی غەیرە عەرەب دەرکەوتن کە ڕۆڵێکی دیارو هێژایان
گێڕاوە لە ئیسلامدا، وەک سەلمانی فارسی و گاوانی کوردی و
بیلالی حەبەشی و ...هتد، چوون لە دەستوری ئیسلامیدا کە
لە قورئاندا سەرچاوە دەگرێ: هیچ کەس لەویتر گەورە ترو
مەزنتر نیە، بەڵکو پێوانەی سەرەکی خواپەرستیە **((ان اكرمكم عندالله اتقاكم))** ، **((لا فضل لعربي علي عجمي الا بالتقوى))**، بۆیە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرو تا نزیکەی
چل ساڵیش دوای کۆچەکە بە دەگمەن گوێ بە نەژادو ڕەگەزو
ناسنامەی نەتەوەیی دەدرا، بەڵکو لە ترسان و خواپەرستی
ڕاستەقینە مەرجی سەرەکی ڕێزو حورمەت و قەدر زانین بوو،
ودلێ.. مخابن پشتی ئەوەی ئەمەویەکان جڵەوی دەسەڵاتیان
گرتە دەست، ئیدی خەلافەتی ئیسلامیش بووە جێک لە
پاشایەتی و میراتگری لە باوکەوە بۆ کوڕ.

ڤێجا نەعرەتەی خێڵ پەرستی و نەتوە پەرستی بردوی سەندو
کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی
کەوەکو ئاژەڵ لە هاودینە
غەیرە عەرەبەکانیان
دەڕوانی و ((برایەتی
ئیسلامی)) هیچ
مانایەکی بۆنەما،
تەنانەت (( خەلیفەکانی
ئەمەوی ئەگەر تەرمێکیان
بدیبا، دەیان پرسی کێ یە؟
ئەگەر دەیانگووت قورەیشیە، هاوریان دەکرد خزمەڕۆ، ئەگەر
بیان گوتبا عەرەبە، دەیانگوت لە هۆزکەمی کرد، بیانگووتایە
عەرەب نییەو موسڵمانە، دەیانگوت ، ماڵی خوایە، دەیداو
دەشی سێنێتەوە!

درۆکردن بە زمانی پێغەمبەرەوەو بە بوختان حەدیس
هەڵبەستن لەتۆڵەکە هەرزانتربوو، گوتیان پێغەمبەر
فەرموویەتی: خوا لە نێو جانەوەراندا، ڕێزی لە بابە ئادەم نا،
لە زارو زیچی ئادەمدا، هەزی عەرەبی هەڵبژارد، لە ناو هەموو
هۆزی عەرەب، قورەیشی زۆر پەسند کردو کردیە گەورەی بەرەی
مرۆڤ، گوتیان عەرەب دەگەڵ ناعەرەبدا هاوکوف نیە، واتا
ئەگەر ژنێکی دەشتەکەی عەرەب؛ مێر بەیەکی وەکو ئەبو عەلی
سینا بکا ((کە عەرەب نیە)) دروست نیە، چونکە پایەی ژنی
عەرەب زۆر لەو پلەیە بەزرترە!!، گوتیان لە ڕۆژی قیامەتا
هەموو دەبێ عارەبی[1] بزانێ دەنا بەشەق دەری دەکەن؟!! گوتیان
و گوتیان ..))

ئیدی خۆسەپاندن و کاری خۆ بەزل زانین و
نەژادپەرستی عەرەب گەیشتە ڕادەیەک کە بە غەیری عەردبی
نووسین جۆرێک بوو لە کوفر، بۆیە گەلێک زاناو بلیمەتی کورد
دەرکەوتن کە خودان سەدان دتێبن، بەڵام هیچیان کوردی نین،
بەکورت و کرمانجی عەردب لەو سەردەماندا لە ژێر پەردەی
ئایندا دەستیان بە پرۆسەی کۆلۆنی کردنی رۆشنبیریی کوردی
کردو شاڵاوێکی بەرفراوانیان کردە سەر فەرهەنگەکەمان.
تەنانەت وەختێک دانانی کتێبی ئاینی بەزمانی کوردی
بڤەبوو، بگرە بە کوفریش لە قەڵەم دەدرا؛ چوون لە کاتی خۆی
کە مێژوو نووس و ڕۆژنامەڤانی کورد بە هەشتی (حوسێن
حوزنی) بە ئارەقی نێوژاوانی خۆی چاپخانەیەکی کڕی و لە
شاری حەلەبەوە هێنایەوە ڕواندنز و لەوێش بە هاوکاری گیوی
موکریانی برای دەستی بەوەرگێڕان و چاپکردنی هەندێ کتێبی
ئاینی وەک ((منهاج)) و ((فتح القریب)) کرد،

> با چیتر بۆ خاتری بەرژەوندی خەڵکی، پێ لە بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانمان نەنێین..!!

نورەدین سەعید وەیسی





ئیدی مەلاو شێخ و سۆفیەکانی ئەوکاتە کردیانە هەراو فەرتەنەو دەیانگووت، ئەی هاوار چۆن بە زمانی زەندەقە دەنووسرێ، ئەمە کوفرێکی **مە حضە**!، ئیدی فتوایاندا کەهەرکەسێک کتێبێکی کوردی بگرێ و بیسووتێنێ غەزایەو خێری دەگاتێ و چەندین قەسرو حۆری دەدرێتێ. بەو هۆیەوە هەروەک گیوی موکریانی دەگێرێتەوە رۆژانە سەدان گۆڤارو پەرتووکیان دەکڕیەوە[۲] دەیانبرد لەماڵی خۆیان یالە مزگەوت دەیان سووتاند!!!

دیارە هەر ئەم هۆیەش بووە کەدەیان زاناو عەللامەی کورد هەلکەوتوون و خزمەتیان بە زمان و فەرهەنگ و کەلتووری عەرەب کردووەو یەک حەرفیشیان بە کوردی نەنووسیوە، وەک ((ئیبنو خەلەکان، ئبنولفیدا، ئیبنو حاجیب، ئیبنو سەلاح، ئیبنو سیرین، ئیبنو حاج، ئەبووبەکری موسەنیف، مەلاجامی، مەلا عەبدوللا بەیتووشی .... هتد.

لە مێژووی نوێشدا دەیانی وەک ئەحمەد شەوقی، مەعروف ئەلروسافی، محەممەد مرری عەلی، عەباس مەحموود ئەلعەقاد، مەحموود تەیمور، عائشە تەیموور، بلند حەیدەری، شێخ محمەد عەبدە، قاسم ئەمین، عەبدولباسیک عەبدولسەمەد و ...هتد.

تەنانەت ئیمام موحەممەدی غەزالی دەڵێ: دینی ئیسلام لەسەر سێ ستوون وەستاوە، ئەگەر خودا ئەوسێ کۆڵەکەی نەدابا، لەوانەبوو تێک بشکێ، ئەم سێ ستوونەش: دینەوەری و ئامێدی و شارەزوورین، کە هەر سێکیان کوردن، بەڵام لێرەدا پرسیاری گرنگ ئەوەیە ئایا ئەوانە کوردن یان نا؟ بەرسڤیش ئەوەیەکە مادامەکێ ئەوانە خزمەتی زمان و فەرهەنگی عەرەبیان کردووە، بە عەرەب دادەنرێن، ئەوەی رازیش نیە، مام هەژار گوتەنی باتێر ئاوی سارد بخواتەوە لەم بارەوە عەمیدی ئەدەبی عەرەبی د. تەها حوسێن دەڵێ: ((ئەبو عەلی سینا بە عەرەبی نووسیوەتی و ئێمە بە عەرەبی دەزانین، جا با ئێرانیەکان هەرهاوار کەن وبڵێن لەخۆمانە))!!

ئەوەی جێگەی ورد بوونەوەو سەرنجە ئەوەیە کە نەتەوە موسڵمانەکانی تری غەیری کورد ئیسلامیان بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان بەکاهێناوە نەک کورد نەبێ کە بە شێوەیەکی زۆر ساویلکانە دەستی بە ئاینەکەیەوەگرتووەو بەرگریشی لێ کردووە، چونکە عەرەب بە سایەی ئیسلامەوە دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی پێکهێناوە تورکیش خیلافەتی عوسمانی و فارسیش ئیمپراتۆریەتی سەفەوی. تەنانەت تا ئێستاش لە ئێراندا کە کۆمارێکی ئیسلامیە پشووی جەژنی نەورۆز کە جەژنێکی نەتەوەیی و نیشتمانیە دوو هەفتەیە، کەچی پشووی جەژنی قوربان و رەمەزان کە دوو جەژنی ئاینین تەنها ٣-٤ رۆژە! کەچی کوردە موسڵمانەکەی خۆمان تا ئێستاش نەورۆز بە بیدعەو گوناه دەزانێت و بە جەژنی ئاگر پەرستانی لەقەڵەم دەدا!!!

دوای سەرهەڵدانی دیرۆکی ئاداری ١٩٩١ گەلێ تاقم و لایەن هاتنە سەر سفرەی حازر بە بێ ئەوەی یەک دڵۆپ خوێنیان لە پێناو کوردستاندا رشتبێت و لەژێر ماسک و دەمامکی ئیسلامەوەکەوتنە شێواندن ودژایەتی کردنی هەستی نەتەوەییمان و بە بەرنامەو پلانی دارێژراوەوە زارۆک و منداڵانی کورد هەڵدەخەڵەتێنن و لەسەر راستەرێی کوردایەتی لایان دەدەن.

براینە ... ئێمە لەبەر ئەوە ئەنفال و جینۆساید و کیمیاباران نەکراین، چونکە موسڵمانین، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە کوردین، بۆیە ئەز بە دڵنیایی و پشت راستیەوە دەبێژم نیشتمان و نەتەوەکەمان لە هەرەشە دایە نەک ئاینەکەمان!!

---

**پەراوێز :**

١- هەژار موکریانی : شەرحی دیوانی مەلای جزیری. چاپخانەی سروشی تاران ١٣٦١.

٢- پێشەکی دیوانی مەلا محەممەدی کۆی چاپی چوارەم، هەولێر - ١٩٦٩.

---

**فەرهەنگۆک :**

دیرۆک : مێژوونووس
خودان : خاوەن
تانهۆژی : تا ئێستا
بەرەڤانی : بەرگری
دویاهی : دوایی
بەسڤ : وەڵام
پشت راست : دڵنیا
سەرهەڵدان : راپەرین

**بەرپرسی ناوەندی رۆشنبیری سۆران (NRS)**
**حوزەیرانی١٩٩٨**



# سڕینەوەی هەستی نەتەوەیی لەگەڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا ناگونجێت!..

ڕێبوار ئیدریس

لەو ساتەوەی نیشتمان و نەتەوەی کورد لە لایەن دەوڵەتانی زلهێزەوە بەبێ خواست و ویستی خۆی بەسەر چەند وڵاتێک دا بەش بەش کراوەو، کەتووەتە ژێر زەبر و زەنگی داگیرکەر و ناحەزانییەوە، داگیرکەران هەتا بۆیان لوابێت نەیان هێشتووە هیچ ئاسەوارێکی کوردی لەسەر خاکی کوردستان بمێنێ، بەڵکو هەمیشە هەوڵی گۆڕینی ناسنامەی کوردیان داوە بۆ سەر نەتەوەکەی خۆیان، ئەوجا بە هەچ شێوازێکی لە خشتە بردن بووبێت.

ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت دوژمنان لە ڕێگەو کەناڵی جیاجیاوە، بەهەموو چەکێکی نامرۆڤانە دژایەتی هەستی نەتەوەییمان دەکەن، بە بێ گوێدانە هیچ عورف و عادەتێکی مرۆیی و شارستانی، یەکێک لەو چەکە کوشندانەی کە ئێستا کەوتووەتە بەکارهێنانی بە تایبەتی لەپاش ڕاپەڕینەوە، چەکی سڕینەوەی هەستی نەتەوەییمانە بەدابو نەریت وزمانو کەلتوورو تەنانەت ڕەوشتی پاک و بێگەردی کوردییەوە.

وانەبێ ئەم دژایەتی کردنەیان بە بێ بەرنامەو لێکۆڵینەوە بێت، بەڵکو هەمیشە لە پیلان دان و، بەبێ سڵ کردنەوە بەهەر شێوازێکی چاو بەست و هەڵخەڵەتاندن بۆیان بلوێ مرۆڤی ساویلکەی کورد لە خشتە دەبەن و تووشی دەردی بێدەرمانی خۆ ون کردنی دەکەن!..تا ئەو ڕادەیەی کەسانێک هەبن حاشا لە کوردێتی خۆیان بکەن وببنە ئەڵقە لەگوێی دوژمنە دێرینەکانی نەتەوەکەیان.

چەکی سڕینەوەی هەستی نەتەوەیی لە بیر و هۆشی مرۆڤی کوردا بە ترسناکترین و نالەبارترین چەک دەژمێردرێ ک دوژمنان بەکاریان هێناوەو دەیهێنن، بەچەندین بڕو بیانووی بێمانا و بێ ناوەڕۆک، بۆ ئەم کارەشیان چەند فاکتەرێکیان کردوونەتە بیانوو بۆ شێواندن وتێکدانی ماڵی کورد، بە تایبەتی بیروباوەڕە مرۆیی وئایینیەکان.

بەداخەوە ناحەزانی کورد هەوڵی ئەوەیان داوەو دەدەن کەوا (بەهۆی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە!!) دژایەتی نەتەوەکەمان بکەن، وەک سەردەمی عوسمانییەکان و ڕەشەکوژییە وەحشیانەکەی (ئەنفالەکان!!).

کەچی هەمیشە سەرقافڵەو ڕابەری گشت شۆڕشەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد،کەسانی نەتەوەیی ئایین پەروەر ئیسلامی ڕاستەقینە بوون کە لە ڕوانگەی ئەم ئایینە پیرۆزەوە دەستیان داوەتە چەکی بەرگری و داکۆکیان لە نیشتمان و



گەلەکەیان کردووە، هەر لە شێخ عەبدولسەلام بارزانی و شێخ سەعیدی پیران تا دەگاتە پێشەوا قازی محەمەد ومستەفا بارزانی رابەر، ئەم زاتە مەزنانە هەمیشە پەروەردەی رێبازی پیرۆزی ئیسلام بوون و هەردەم پێشڕەوو خزمەتکاری نەتەوەکەیان بوون، بۆیە لەکات و سەردەمی خۆیان دا میللەتی کورد بەیەک پارچەیی ویەک هەڵوێستی دوایان کەوتووەو بە رابەری خۆی زانیوون.

یەکەم فاکتەری سەرکەوتنی شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەکەمان ئەوە بوو کە ئایین وبیری نەتەوەیی ئاوێتەی گیانی بەرخۆدان و بەرگری کردن لەنیشتمان بوون بۆیە هەمیشە پێشمەرگە لەروانگەی ئایینەکەیەوە دەیڕوانیە نەتەوەکەی ولە خۆشەویستی نەتەوەکەیەوە ئایینەکەی لە لا پیرۆزتر دەبوو..چونکە نەتەوەو ئایین دوو جەستەی یەک ڕۆحن و لە یەکدی جیاکردنەوەیان قابیلی قبوڵ کردن نیە.

سەرۆک (مستەفا بارزانی) وەک رابەرێکی نەتەوەیی کورد هەردەم داکۆکی لە ئایینی ئیسلام کردوە، پاراستن و رێزلێنانی لە ئایین بە بەشێک لەبەرگری کردن لە نەتەوەکەی زانیوە وهەمیشە ئەم دوولایەنەی ئاوێتەی خەباتی کوردایەتی کردوون.

ئەمەئەوەمان بۆدەسەلمێنێ کەوا بیری نەتەوەیی وئایین جیاکردنەوەیان لەیەکدی تەنها لەخزمەتی ناحەزان ولە دژی میللەتەکەمانە.

ئەمڕۆش لە سایەی پەرلەمانی کوردستان وکابینەی سێیەمی حکومەتی کوردستانەوە بەدەیان و سەدان مزگەوت وقوتابخانەی ئایین کراونەتەوەو پشتگیریەکی زۆری مامۆستایان و قوتابیانی ئایین کراوە و دەکرێت، (چالاکییەکانی وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئیسلامی شاهیدی ئەو راستیەن) چونکە یەکێک لە ئەرکە پیرۆزەکانی مرۆڤی کورد پەروەر و خاوەن بڕوای راستەقینەی نەتەوەیی، پاراستنی دابونەریتی نەتەوەکەیەتی، ئەمڕۆش زۆرینەی نەتەوەی کورد موسڵمانە و دابونەریتی ئیسلامی پەیرەو دەکات، هەر لەم روانگەیەوە حکومەتی کوردستان خزمەتی ئەم ئایینە پیرۆزە دەکات، بە هەمان شێوە موسڵمانی راستەقینەش دەبێت خزمەت کردنی نەتەوە و نیشتمانەکەی بە بەشێک لە جێ بە جێ هێنانی ئەرکی ئایینی بزانێت و رێگە نەدات بە شێوەیەکی تەحریفی لە دژی میللەتەکەی و نیشتمانەکەی بەکار بهێندرێت.

ئەوە تانێ لەزۆر ولاتانی دنیادا ئایین بۆپاراستنی کیانی نەتەوەیی بەکار دەهێنرێت و لەرێگەی ئاینەوە سەربەخۆیی و بوونی خۆیان مسۆگەر دەکەن، نوێترین نموونەش گەلی (چیچان)ە، ئەم گەلە هەستی نەتەوەیی و ئایینیان ئاوێتەی یەکدی کردن و لە ئەنجام دا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا، خۆ ئەگەر ئەم دوولایەنەیان لە یەکدی جیا بکردایەتەوە نەدەبوونە خاوەنی ئەوەی کە ئێستا هەیانە.

کەواتە دەبێت مرۆڤی کوردی موسڵمان وریاو ئاگادار بێت لە پیلان و نەخشەی چەواشەکارانەی دوژمنانی کوردو کوردستان.دەبێت هەمیشە خەونی نەزۆکی ناحەزان و گێرە شێوێنان پووچەڵ بکاتەوەو رێگە نەدات بە هۆی ئایینەکەیەو دژایەتی نەتەوەکەی بکرێت و بە پێچەوانەشەوە، هەروەها دەبێت رێگە نەدات ئایینەکەی لەکەدار بکرێت وبیکەنە فاکتەری لەناو بردنی نەتەوەکەی، چونکە ئایینی پیرۆزی ئیسلام تاقە ئایینەکە بە راشکاوی و بە بێ پێچ وپەنا داکۆکی لە ئازادی گەلان و سەرفرازی سەرجەم نەتەوەکانی سەر زەمین دەکات.





# سەلاحەدین و مەلیکەکانی کوردی ئەیوبی



عەبدولخالیق سەرسام

کاتێ سەلاحەدین ئەمری خوای کرد بە رەحمەت بێ تەنیا دینارێک و ٣٦ سی و شەش درهەمی لە دوای خۆی جێهێشت، نەک تەنیا لە گیرفانی خۆی کە هیچی تێدا نەبوو، بەڵکو لە نێو خەزێنەی دەولەتەکەی کە لە سودان و لیبیا (برقە) و یەمەن و حیجاز و ((عەرەبستان)) و میسرو شام و کوردستان پێک هاتبوو لە وولاتانی شام ئەبەستمان سوریا و لبنان و ئوردن و فەلەستینە کوردستانیش ناوچەکانی کوردستانی عیراق و تورکیا و سوریای دەگرتەوە تا دەگاتە ئەرمینیای ئەو کاتە جگە لە ئەسکەندرونەو زۆربەی ئەنادۆڵی ئەو کاتە، ئینجا خەڵکەکەش لەو پەڕی ئیتتاعەو دڵسۆزی دابوون وخۆشیان دەویست لە فەرمانەکانی دەرنەچوون ئەملەکەتەکیان دەپاراست.

پارەی زۆری بە دەست دەکەوت، بەڵام بە رەحمەت بێ دەی وت:(( پارەو خۆڵم لە لا وەک یەکە)) بۆیە هەر کەسەی داوای لێ دەکرد هەناسە ساردی نەدەکرد، ئەگەر هەر هیچی نەبوایە دەی ووت خەزێنە ئەوەندە قەرزاری تۆیە کە پارەمان بوو وەرە وەری گرە بۆیێ خەزنەدارەکان زۆرجار هێندی پارەیان بۆ رۆژی تەنگانە لێ دەشاردەوە لە ئازایشا تاکی نەبوو. بە خۆی لە هەموو جەنگەکان بەشداری دەکرد هەر دەە پێنج سەد تا حەوت سەد سوار چاکی کوردی لە دەورە بوو شەش جاران سوپای هەموو پاشایانی ئەوروپای شکـ. جگە لەوەی وەک بروکلمان دەڵێ کۆتایی بە حوکمی سەلجوقیەکان هێنا لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا،و لە میسر لە سەرکەوتنی یەکەمیدا توانی بە دوو هەزار سوار لەسپی کوردەوە پەنجا هەزار لە ئەفرەنج و سودانیەکان تێک بشکێنێ کە هەموو مێژوونووسان باسی دەکەن و وەک عاجباتێکی ئەو سەردەمە.

سەلاحەدین خەڵکی کوردستانی عیراقە باوکی لە (دوین)ی سەر بە ئازربێجانی ئەو کاتە لەسەر ((چیای گور)) لە نزیک دوین لە دایک بووە کە بە عەرەبی نووسیویانە ((جبل جور)) و ئێستاش شوێنەکە پێی دەڵێن ((گۆر فەقێ ئەیوب)) و چەند کیلۆمەترێک لە دوینەوە دوورە، چونکە ئەوان (رەوەند) واتا کۆچەر بوینە هەر جارێ لە شوێنێک رەشماڵیان هەڵداوە و بە ئەسلیش خەڵکی گوندی (ئەجنداکان) ئەجندەکان بوینە و ئێستا پێی دەڵێن ((قەلاتەجن)) بەرامبەر دەرگای دوین وەک ئیبن خەلەکان باسی دەکا.. تەنیا هەڵەکەی یاقوت الحموی ئەبێ کە لە نێوان چەند شوێنێک شوێنێک بزر دەکات... و ((ئیبن و الخلکان))یش هەمان هەڵە دوبارە دەکاتەوە کاتێ دەڵێ :(اتفق اهل التاریخ) کە مەبەستی (یاقوت الحموی)یە چونکە (ولسترنک ) دەڵێ مەبەستی ابن خلکان لە (اهل التاریخ) یاقوت الحمویە کە زۆر زانیاری لەوەوە وەرگرتووە کەواتە تەنیا داکۆکیەکە لەسەر ئەوەیە لەو سەری سنووری ئازەربایجان بەلای ئاران و ئەرمینیاوە یان بە پێچەوانەی بەڵام راکانی تری ابن الخلکان هەمووی لەگەڵ شوێنی دۆزینەوەی گۆری باپیرە گەورەو ناوی گوندەکەو شوێنی دوین لەسەر سنووری ئازربیجان گونجاوە... بەهەر حاڵ ئەمانە بە شێوەیەکی زانستیانە لە ژمارە (٢١)ی گۆڤاری گوڵان باسکراو لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا. لەگەڵ مامۆستاکانی بەشی مێژووی زانکۆی



سەلاحەدین.... خوێنەری ئازیز دەتوانێ سەیری بکات، و ئاشکراشە کە سەلاحەدین (هەزبانیو ڕەوەندو زەرزاری) بووە کە ناوی عەشیرەتەکەیەتی وە (هۆزەبانی) واتا عەشیرەتەکانی سەروو یان سەرووی هەولێر ـ هۆز = عشیرە + بان واتا سەروو. وەک ئێستاش هەموو خێڵە ڕەوەندەکان لە دەورو پشتی دوین وەک زراری و هەرکی و سورچی و خەیلانی و .. شێخ مەمەوەند... هتد وە وەک ئیبن **کثیر** باسی ئەوە دەکا کە شێرکۆی مامی سەلاحەدین زەرزاریە. و یا چۆن عماد الکاتب کتابەکەی (**الروضتین في اخبار الدولتین**) لاپەڕە (٦٠) یان ٢١٨؟ کە لە نوسینی ئەبو شامەیە باسی لەوە کراوە ناوچەی زەرزاریەکان سەر بە هەولێر بوون.

* بەمە دەردەکەوێ کەوا زراریەکان پاشماوەی زەرزاریەکانن بۆ ئەمانە هەموو و پێک چونی ناوی گوندەکەی کەوا زراریەکان پاشماوەی زەرزاریەکانن.

بۆ ئەمانە هەموو و پێک چونی ناوی گوندەکەی ئێستاو قەڵاتە (جن) و ئەجندەکان و دۆزینەوەی گۆڕی پیرمەروان لە هەمان دێ و باس کردنی لەلایەن (نیبورو) گەشتیاری بە ناوبانگو ج. س. بوکنکهام لە ساڵی ١٨٢٧ بە سەلماندنی و ئاماژە کردن بۆ ئەم (دوینە)ی نزیک هەولێرە. کەواتە سەلاحەدین ناوی (یوسف) ە کوری (ئەیوب) کوری (شادی) کوری (مروان) کوری (ئیسحاقە) لە تیرەی زەرزاریە (رەوەندە) لە هۆزەبانیەکانە، کاتی خۆی وەک لێکم داوەتەوە لە دەوروبەری ساڵانی (٥٠٠هـ) شادی گوندی (ئەجندەکان) بەجێ دەهێڵێ کە سەر بە وولاتی (الجزیرە)ی (**موصلە**) دەچێتە (دوین) کە سەر بە ئازربێجان بووە و چەند کیلۆ مەترێک لێک دوورن وەک شوێنەکە و شوێنەواری ودیواری سەرچیاو نەخشەی لسترنگ هەمان مانا دەدەن بە دەستەوە. لەوێ بۆ ماوەیێکی زۆر دەمێننەوە تا

سەلجوقیەکان دێن و ئەم وڵاتانە داگیر دەکەن لەوانەش هەولێر کە پایتەختی هۆزەبانیەکان بووە (ابو الموسک الکردی الهزبانی) و باپیری سەلاحەدین (شادی) بەگەڵ سەلجوقیەکان دەکەون و پشتی خەلیفە ناگرن، چونکە لە کاتی خۆی زۆریان ئەزیەت بە دەست

خەلیفەکانی بەغداوە دی بوو لەوانە شۆڕشەکانیان بە سەرۆکایەتی محمد بن هلال کە لە نزیک خازر حەمدانیەکانی **موصل** تێک دەشکێنن پاشان خەلیفە سوپا دەنێرێ و ئاو دیوی ئازربیجانیان دەکا... پاشان بە ماڵ و مناڵەوە تەسلیم دەبنەوە. لێرەدا ئیبن **کثیر** دەڵێ: ئەگەر هۆزەبانیەکان حاکمانی هەولێر ئەگەر پشتی



سەلجوقیەکانیان نەگرتبوایە ئەوا خەلیفە تەسلیم بە شەرتەکانی سەلجوقیەکان نەدەبوو بەهەر حاڵ مێژووی هاتنی سەلجوقیەکان و گرتنی هەولێر بێ شەڕ دەکەوێتە مێژووی ساڵانی (٥٢١) و (٥٢٢) کۆچی وە هەر لەم ساڵانەش دیارە بەهروز بە (دوین) تێدەپەڕی یا لەوێ دەبێ پێشتر وەک ئیبن خولەکان باسی دەکا لەگەڵ باپیری سەلاحەدین (شادی) یەکتر دەناسن و هەر ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی (تکریت) یان بداتێ لێی بینە(دژدار) واتا بەڕێوەبەری قەڵاتەکەی. دژ = قەلا + دار بە واتا قەلادار لەسەر کێشی (دەسەلاتدار) وەک رەواندز کە بووتە رەواندز کە بە مانای قەلای رەوەندان دێت.. وە لەوێ لە تکریت دیارە (شادی) هەر زوو ئەمری خوا دکا ئەیوب و شێرکۆ حوکمرانی تکریت دەکەن... تا ڕۆژێکیان عمادالدین زەنگی ئەتابەکی خاوەن **موصل** لە شکانیا لە شەڕێکدا لەگەڵ (قەراجا) کە لایەنگیری بە هرۆزەوە بەغدا بووە دێتە تکریت دەی پەڕێننەوە و تیماری دەکەن .. بەمە پەیوەندی نێوانیان بەهێز دەبێ. وە بهروز بەمە دەزانێ جگە لەمەش لەسەر ژنێک کە هانا بۆ شێرکۆ دینێ لەدەست ئەفسەرێک کە خزمی (بهروز)ە شێرکۆ

ـەرەکە دەکوژێ بەمە جێگایان لە تکریت ـەو... و وەک لە لاپەرە (٨) سەلاحەدینی ئەیوبی ـیەکەی دکتۆر محسن محمد حسن دا هاتووە دەڵێ ـە بەهروزبان وت خۆت لە قەرەی ئەم بەرەبابە مەدە ـەگێت گیرگرفتت بۆ پەیدا دەکەن کەواتە بەمە بە دیار ـەکەوێ کە شێرکۆ و ئەیوب خانەدان و ئەمیرو خاوەن ـشیرەت و نزیک بە ناوچەکە بوون، ئینجا لە ساڵی ٥٣٢ کۆچی لەو کاتەی سەلاحەدین لە دایک دەبێ ـکریت بەجێ دەهێڵن بەرەو **موصل** وە لە ڕێگا نجم ـین (ئەیوب) ویستی سەلاحەدین بکوژێ لەبەر ـەی زۆر دەگریا لەو کاتەی ئەوان بەرەو پاشەڕۆژێکی ـیارو ترسناک هەنگاویان دەنا. بەڵام وەک مێژوو ـی دەکا کاتبە (مەسیحیەکان) ناهێڵێ دەڵێ بەڵکو ـە پاشەڕۆژ دەبێتە پیاوێکی گەورە بەمە مرۆڤ بیر ـەوە دەکاتەوە بۆ دەبێ کاتبی هەزبانیەکان مەسیحی ـێ دیارە دەبێ بە خەتی ئارامی نووسیبێتیان نووسی ـی... هێشتا دیارە هەتا ئەو ساڵانەش بێ دەبێ خەتی ـرامی باو بووبێ شان بە شانی (خەتی عەرەبی) کە ـەمە پرسیارێکی گەورەم لا دروست دەکات... بە ـیبەتی وەک لە لام ڕوون بووەتەوە کە تا ئەم ساڵانەی ـەو کاتەش زەردەشتیەت لە زۆر شوێنی کوردستان ـبووەوە. بە هەرحاڵ با بێینەوە سەر سەربردەی ئەیوبی ـوکی سەلاحەدین (یوسف) و شێرکۆی مامی کە دەچنەوە **موصل** (عماد الدین زەنگی) پێشوازییەکی گەرمیان لێ





دەکا..ئینجا (شارەزور)یان بۆ ماوەیێکی کەم دەداتێ پاشان (بعلبک) پاش ئەوەی عمادالدین دەمرێ. کاتێ نورالدین لەسەر حوکمە لەگەڵ بەرەبابێکی تربان کە مەبەست کورانی (توغتەکین)ە لە دمشق، دەکەونە ناکۆکی... شێرکۆ سەرکردەی لەشکری (حلب) و لە لای نورالدین دەبێ و هەروەها ئەیوب سەرکردەی سوپای توغتەکی لە دیمەشق... کاتێ ویستیان یەکتر بکوژن... کەوتنە گفتوگۆ بە جۆرێکی وا پێک هاتن کە هەردوو سەرکردەکانی حەلەب و (دیمەشق) ڕازی بن بەڵکو زێتر ڕێزیان لێ گیراو پایە بەرزتریش بوون هەر ئەم یەکتر گرتن و شەڕنەکردنە لە نێوان ئەم دوو برا کوردە بوو بووە هۆی ئەوەی بتوانن بەسەر هەموو هێزەکانی سێ کیشەوەر زاڵ بن کە هێرشیان دەهێنایە سەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

کاتێ (فاتمیەکان) لە دەست ئەفرنجان لە میسرا هاواریان لێ هەڵدەستێ پرچی ژنەکانی کۆشکی پاشا دەنێرنە شام بە هانایانەوە بچن.. شێرکۆ و سوپاکەی دەنێرن.. شێرکۆ سوپاییێکی تایبەتی خۆی هەبووە بە ناوی ((الاسدیە))و هەروەها ۲۰۰۰ دوو هەزار سوار چاکیشی هەڵبژاردوە لەگەڵ خۆیا کە بێگومان کورد بوون وە لەگەڵ ئەو سوپایەی (نورالدین) لەگەڵیا دەنێرێ بە پارەیێکی





زۆرەوە. شـێرکۆ دەچێتــە میسـر وە پاش سـەرکەوتن (شـاور)ی سـەرەک سوپای میسر دەیـەوێ خیانـەتیات لێ بکات وە لـە دوهـەمین گەرانـەوە بـۆ میسـر شـێرکۆ دەتوانێ بەسەر پەنجا هـەزار ئەفرنجـە و دوژمنـەکانی دا زاڵ بێــت... وە هــەروەها لەناو بردنی (شـاور)یش، بەمـە شـێرکۆ دەبێتـە سـوپا ســالاری (اسفهســالار)ی میسـر و پـاش دوو مــانگ ئەمری خوا دەکا.. **(صلاح الدین)**ی برازای لە شوێنی ئەو دەکەنە سوپا سالار... بـەلام سەرکردەیێکی سەلجوقی خۆیی و پیاوەکانی بەمە رازی نابن دەگەرێنـەوە بـۆ شـام بەمـە کوردەکـان بـە تـەنیا دەمێننـەوە لەگـەڵ هـەندێ مەمالیک. سوپای تایبـەتی (معز دەولـەی فـاتیمی) کە سودانیە رەشـەکان بـوون دەیانـەوێ دژ بـە سـەلاحەدین بووەستن، بەلام هەموویان تەفروتونا دەکەن و راویان دەنێن تا سودان. ( کە ژمارەیان دەڵێن پانزە هەزار کەس بـووە). بەمــە دەولـــەتی فـــاتیمی دەکەوێتــە ژێـــر رەحمـــەتی سەلاحەدین... و سەلاحەدین هەر زوو بیر لـەوە دەکاتـەوە میسر نەداتەوە بە کەس بۆ خۆی سەرکردایەتی بکا کە هەر خۆشی سـەرکردەی بێ هاوتا بوو کـەس نـەبوو لـە پێشـیا بووەستێ... ناردی بە دوای باوکی لـە شـامەوە بێتـە لای ئـەوە بـوو بـاوکی بـە هــەموو مـاڵ و منـاڵ و خێـڵ و خێڵەساتیەوە وەک مێژوونووسـان باسـی دەکـەن بـەرێ دەکەوێ بۆ میسر بەلام لە راستیدا خۆ ئامادەکردن بوو بۆ جیابوونـەوە لـە نورالدیـن زەنکـی... نـەک (خوتبـەی عەباسـی) خوێندنـەو، کـاتێ ئـەمیر (ئـەیوب) بـاوکی سـەلاحەدین دەگاتــە میسـر وەک چـۆن (جورجی زیـدان) باسی دەکا پێشـوازییێکی شاهانە دەکرێ. وە لـە کۆشـکی شاهانە دادەنرێن. سەلاحەدین بەمە زیـتر بەسـەر هـەموو میسـر زاڵ دەبێ (پاشای فـاتیمی) زۆر لـێی دەترسـێ و خاتری دەگرێ تا ئەو رۆژەی (اعلانی خوتبـەی عەباسـی) دەکا و کۆتایی بـە حوکمـی خەلیفـەی فـاتیمی دەهێنـێ، بــەڵکو خوتبــەی عەباســـی دەخوێندرێتـەوە چیـتر نـاوی معز الدولـەی فـاتیمی لـە مزگـەوتا ناخوێندرێتـەوە. بە واتـا وڵاتەکـە دەکـا بـە شـافیعی. خەلیفـەی فاتیمی بەمە بەزگ دەداو دەمرێ کە لە کۆشکەکەی گەمارۆ درابوو، لـە لایـەن (قـەرەقوش) وەزیـری ســـەلاحەدین. ((حوکمـــی قەرەقوشیش هـەر لـەوەوە هـاتووە کـە گاڵتـە کردنێکـە بـە حوکمـی کورد)). لەو کاتەدا کە هێشتا بە چاکی فێری حوکم نەبوینە. چونکـە قـەرەقوش ژن و پیاوەکـانی لێـک جیاکردەوە نەوەک زاوزێ بکەن.

بەمـە سـەلاحەدین پـارەو موڵکـی خەلیفـەی فـاتیمی کەوتـە بـەر دەسـت بـووە حـاکمێکی سـەربەخۆی (میسـر). پاشـان سـاردی کەوتـە نێـوان ئـەوو نورالدیـن لـە شـام کـە چاوەرێ بوو یارمەتی بدا لە شەرەکانی لـە لای (کـەرەک) بەلام سـەلاحەدین نـەچوو نـەوەک نورالدیـن لـێی بـە فێـڵ بێ... ئەمەشیان زیرەکایەتیەک بوو.

ئینجا دیارە بۆ ئەو مەبەستەو خۆ ئامادەکردن بۆ جیابووەنـەوە لـە نورالدیـن سـەلاحەدین تـوران شـاهی بـرا گـەورەی خـۆی نـاردە (سـودان) بگـرێ. بـۆ ئـەوەی ئەگـەر نورالدین هێرشی هێنا شوێنێکیان هـەبێ پاشـەکشـەی لـێ بکـەن... بـەلام تـۆران شـاه گـەراوە ووتـی سـودان گـەرمـە سەلاحەدین ووتی برۆ (یەمەن)بگرە چونکـە (نجم الدین عمارە الیمنی)ی شاعیر بە شیعر باسی جوانی یەمـەنی زۆر لـە لایان کردبوو. وە توران شاه یەمـەن دەگـرێ... قوتابخانـەی شـافعیەت لـەوێش دەکاتـەوە. هـەر لـەو کاتانەبوو ساڵێکی نەخایاند نورالدین لە شام ئەمری خوا دەکا، سـەلاحەدین بـە خـۆیی و ٧٠٠ حـەفت سـەد سـواری کوردی هەڵبژرادە بەرەو شام بەرێ دەکەوێ قەلاکان دەرگای بـۆ دەکەنـەوە، تـەنیا قـەلاتی (حلب) نـەبێ. پـاش گیروگرفتێکی زۆر ئەویش کەوتەوە دەست سەلاحەدین. لە ١٧ سەفەر ساڵی ٥٧٩ کۆچی - ١١٨٣ زاینی.

ئینجـا لـە پاشـانا سەلاحەدین مـــوصل و ولاتی





کوردستان بە قەڵاو شارەکانەوە دەگرێ و زۆربەشیان بێ شەڕ بە شێوەی گفتوگۆ چاووڕاوو بەرژەوەندی گۆڕینەوە بۆ حرمەت کردنی دەوڵەتە کە بوو بەرژەوەندی گشتی... هەروەها ئیش تادەگاتە ئەرمینیا و لە خوارەوەش تا شارەزوورو دەقوق. موزەفەرەالدین کوکبری لە هەولێر دادەمەزرێنێ و شارەزووری دەداتێ. کە زاوایەتی واتا خوشکی سەلاحەدین ربیعە خاتوون خێزانی موزەفەرالدینە. پاش ئەوەی قووڵایی سەربازی و هەموو سنوورەکان دابین دەکا ئینجا هێرش بۆ رۆژئاوایی دەبا هەمووی دێنێتە ژێر حوکمی ئیسلامی خۆیی و هێزی سەربازی کورد. پاشان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ رۆژئاوا مۆر دەکا.. واتا ئەفرەنجەکان) و لە هەموو جیهان رەوشتی بەرزی باس دەکرێ تا لە ئەوروپاش فێرە زۆر شت دەبن لە سەلاحەدین.. تا ساڵی ٥٩٨ کۆچی کۆچی دوایی دەکاو هەموو جیهانی ئیسلامی دەیکا بە شین و واوەیلا و رەش پۆشی دای دەگرێ و لە دوای خۆی کورەکانی کە هەڤدە (١٧) کوڕو کچێکی هەبوو حوکم دەکەن لەگەڵ براکانی و برازاکانی. بۆیێ باسی شەرەکانی ترم نەکرد کە پانزە ساڵ دەخایێنێ چونکە بە سەدان کتێبی لەسەر نووسراوەتەوە گرنگیم دایە ئەو لایەنانە کە بە چاوێکی کوردانە سەیری نەکراوە.. زۆر گرنگیشم بەڕوخانی ئەیوبیەکان داوە لە میسر کە لە دەرفەتێکی ترا باسی رووخانیان بکەم لە یەمەن و شام و شوێنەکانی تر بە دەست هۆلاکۆ و مەمالیک.

**ناوی ئەو مەلیکە کوردانەی کەوا میسریان حوکم کرد (ئەیوبیەکان)**

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | | ناوی تەواویان |
|---|---|---|
| ٥٦٥ هـ یا ٥٦٧ | ١١٦٩ م | صلاح الدين(يوسف) الملك الناصر السلطان صلاح الدين صلاح الدين والدنيا |
| ٥٨٩ هـ | ١١٩٣ م | عماد الدين عثمان العزيز الملك العزيز |
| ٥٩٦ هـ | ١١٩٦ م | محمد بن عبدالعزيز الملك المنصور |
| ٥٩٥ هـ | ١١٩٨ م | سيف الدين ابوبكر الملك العادل |
| ٥٩٦ هـ | ١١٩٩ م | محمد الكامل الملك الكامل بن الملك العادل |
| ٦١٥ هـ | ١٢١٨ م | سيف الدين ابوبكر الملك العادل (الثاني) |
| ٦٣٦ هـ | ١٢٣٨ م | نجم الدين ايوب الثاني الملك الصالح |
| ٦٣٧ هـ | ١٢٤٨ م | توران شاه بن الملك الصالح الملك المعظم |
| ٦٤٨ هـ | ١٢٥٠ م | شجرة الدر |

(١) ئەم چوار مەلیکە دیمەشقیشیان حوکم کردووە.
بە دەستی مەمالیکەکانی خۆیان حوکمیان لە دەست دا لە میسر.

**ناوی ئەو مەلیکە کوردانەی لە دیمەشق حوکمیان کردووە (ئەیوبیەکان)**

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | ناوی تەواویان | |
|---|---|---|
| ١١٨٦ | نورالدين علي | - الملك الافضل |
| ١١٩٦ | سيف الدين ابوبكر | - الملك العادل |
| ١٢١٨ | شرف الدين عيسى | -الملك المعظم |
| ١٢٢٧ | صلاح الدين داود | -الملك الناصر |
| ١٢٢٨ | موسى الاشرف | (سلطان الجزيرة ) واتا كوردستان |
| ١٢٣٧ | اسماعيل الصالح | |
| ١٢٣٧ | الكامل | - (سلطان مصر) |
| ١٢٣٨ | الصالح | - (سلكان مصر) |
| ١٢٤٥ | المعظم | - (سلطان مصر) |
| ١٢٤٩ | صلاح الدين يوسف | - (سلطان حلب) |

بەدەستی مەغۆلەکان (هۆلاکۆ) لەناوچوون.

## مەلیکە کوردەکانی ئەیوبی کە (حلب)یان حوکم دەکرد

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | ناوی تەواویان |
|---|---|
| ١١٨٦ | غياث الدين غازي بن طاهر |
| ١٢١٦ | غياث الدين محمد - العزيز |
| ١٢٣٦ - ١٢٦٠ | صلاح الدين يوسف - الناصر |

ە دەستی مەغۆلەکان (هۆلاکۆ) کۆتاییان هات

## مەلیکەکانی کوردی ئەیوبی لە (جەزیرەو بۆتان) (کوردستان)

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | ناوی تەواویان |
|---|---|
| ١٢٠٠م | نجم الدين أيوب -الملك الاوحد |
| ١٢١٠م | مظفرالدين موسى -الملك الاشرف |
| ١٢٣٠م - ١٢٤٥م | مظفر الفاري |

## مەلیکەکانی ئەیوبیە کوردەکانی کە لە (حماه) مەلیکاتیان کردووە

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | ناوی تەواویان |
|---|---|
| ١١٧٨ | مەلیک تقي الدين عمر مظفری یەکەم |
| ١١٩١ | مەلیک محمد منصوری یەکەم |
| ١٢٢٠ | مەلیک قلنج ارسلان الناصر |
| ١٢٢٩ | مەلیک تقي الدين محمود ...... مظفری دووەم |
| ١٢٤٤ | مەلیک محمود منصوري دووەم |
| ١٢٧٤ - ١٢٩٨ | مەلیک محمود مظفري سێهەم |

## ئەو ئەیوبیانەی خۆیان لەگەڵ مەمالیکە تورکەکان گونجاند

| ساڵەکان | ناویان |
|---|---|
| ١٣١٠ | ابو الفداء اسماعيل المؤيد المؤرخ المعروف |
| ١٣٢٢ - ١٣٤١ | محمد الافضل |

ە دەستی مەمالیکەکان کۆتای حوکمیان هات





## ئەیوبیەکانی (حمێ )

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | ناوەکان |
|---|---|
| ١١٧٨ | محمد بن شێرکۆ |
| ١١٨٥ | شێرکۆ – مجاهد |
| ١٢٣٩ | ابراهيم المنصور |
| ١٢٤٥ ـ ١٢٦٢ | مظفرالدين موسى الاشرف |

بەدەستی مەمالیکەکان لەناو چوون.

## ئەیوبیەکانی عەرەبستان ... (یەمەن سعودیە)

| ساڵی هاتنە سەرحوکم | ناوەکان |
|---|---|
| ١١٧٣ | توران شاە کوری ئەیوب المعظم |
| ١١٨١ | طفتكين بن أيوب (سيف الاسلام) |
| ١١٩٦ | معزالدين اسماعيل |
| ١٢٠١ | ايوب الناصر |
| ١٢١٤ | سليمان المظفر |
| ١٢١٥ ـ ١٢٢٨ | صلاح الدين يوسف المسعود |

بە دەستی مەمالیکە رەسولیەکان کۆتایی حوکمیان هات.

### سەرچاوەکان


بۆ ئەم باسە زانیاری لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١ـ شرفنامە، شرفخانی بتلیسی.

٢ـ سەلاحەدینی ئەیوبی ژیاننامەی گەشتەرین ـ دکتور محسن محمد حسین.

٣ـ طبقات السلاطين الاسلام، استانلي بول – ترجمة عباس اقبال.

مەعلوماتەکە لە (( خلاصة الذهب المسبوك، مختصر من سير الملوك ، تأليف عبدالرحمن سنبط قنيتو الاربلي المتوفي سنة ٧١٧ هـ)).

٤ـ الفتح القسى الفتح القسى، عمادالدين الاصفهاني.

٥ـ الروضتين في اخبار الدولتين، ابو شامة.

٦ـ ايام صلاح الدين، احمد بيلي.

٧ـ اسد القارين، آب هەوری.

٨ـ براونە گولان ژمارە (٢١) صلاح الدين من اران ولا من ارمينيا بل من كردستان العراق ـ عبدالخالق سرسام.

٩ـ تأريخ دول الاسلام، للحافظ شمس الدين بن عبدالله بن (قايماز التركماني) المتوفي سنة ٤٤٨ هـ.

١٠ـ بلدان الخلافة الشرقية، لتزنك.

١١ـ الموسوعة العسكرية ، ج٢، المؤسسة العربية للدراسات والنشر.

١٢ـ عيوبٌ التواريخ لحمد بن شاكر ، الكتي، جزء(٢٠).

١٣ـ وفيات الاعيان، ابن الخلكان.

١٤ـ ياقوت الحموي، معجم البلدان.

١٥ـ البداية والنهاية، ابن كثير.

١٦ـ تقويم النيل، احمد سامي باشا.

١٧ـ التاريخ الباهر، ابن الأثير.

١٨ـ رحلة نيبور في القرن الثامن عشر.

١٩ـ النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية ، ابن شداد.

٢٠ـ تاريخ اربيل، زبير بلال.

٢١ـ اربيل في العهد الاتابكي،د.محسن محمد حسين.

٢٢ـ الايوبيون في شمال الشام والجزيرة، محمود ياسين التكريتي.

٢٣ـ گەرانی مەیدانی لە شوێنەوارەکان.

٢٤ـ گۆڤاری ماف ژمارە ٢٢ ١٦ ئایار ١٩٩٨.

بڕوانە نووسینی (اخطاء بعض المؤرخين عن الكورد/ عبدالخالق سرسام).

٢٥ـ مظفرالدين كوكبرى، عبدالقادر احمد طليمات.

٢٦ـ تاريخ اربل، ابن المستوفي.




## ملوك بني ايوب او شجرة الايوبيون (الملحق)

صلاح الدين يوسف الملك الناصر (ولادته ٥٣٢ وفاته ٥٨٩)




(١) ئەم سەجەلەیەم لە کتابەکەی / استانلی بیل وەرگرتووە تەنیا ناوو لەقەبی شادی کوڕی مەروان بەگوێرەی مێژوو زیدە نووس کردوە .
مەروان بە واتای مەر + وان .... لە سەر کێشی شوان گاوان پەزەوان هاتووە بە واتای ئەو کەسەی مەڕ بە خێو دەکا.... یا شوانی مەڕانە. کە ئەمەش ناوێکی ڕەوەندانەیە.

# (شجرة الايوبيون)



گەردیلە باسێک

# سەلاحەدینی ئەیوبی لەدیدی مێژوونووسانو رۆژهەڵاتناساندا

**ئامادەکردنو وەرگێڕانی: رەشاد قادر**
**قوتابی ماستەر لەکۆلێژی ئەدەبیات**

ناوو شۆرەتی سەلاحەدینی ئەیوبی نەك هەر لەنێو وڵاتی ئێمەو وڵاتانی دەوروبەر بڵاوبوتەوە، بەڵکو لەسەرانسەری جیهاندا زۆر بەفراوانی بڵاوبۆتەوە، بگرە مێژوونووسانو رۆژهەڵاتناسان زیاتر لە ئێمە شارەزاییان هەیە سەبارەت بەجوامێریو زیرەکیو بوێری سەلاحەدینی ئەیوبی.

نووسەرانی ئەوروپا بەراشکاوی دانیان بەرەوشت بەرزیو ئازایەتی ئەم کەڵە سەرکردەوە ناوە (ستیڤینسون Stevenson) زۆر لەسەر رەوشت بەرزیو ئازایەتی سەلاحەدین بەگوڕ بووەو ستایشی کردووەو دەڵێ رەفتاری زۆر نەرمو جوانی نواندووە بەرامبەر بەدوژمنانی کاتێك کەلەو پەری سەرکەوتندا بووە.

رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ ٠کارل بورکلمان) لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا (مێژووی میللەتانی ئیسلامی) دەڵێت: خانەدانیو جوامێری سەلاحەدین گەیشتبووە ئەم رادەیەی کە دوژمنانیشی نەیانتوانیووە ئەم رەوشتە بەرزانەی ئەو بشارنەوەو دانیان پێدناوە. نەك هەر ئەمە بەڵکو سەلاحەدین پشتیوانی زۆری زانستو زانیاری دەکرد). دەوڵەتی سەلاحەدین پڕ بوو لە قوتابخانەو نەخۆشخانە، جگە لەمەش ژمارەی زانایانو ئەدیبان لەکۆڕی دی زیاتر بوو لەسەرکردەو سەرتیپەکانی سەربازەکان. جارێکیان زانایەك سەردانێکی کتو پڕی بۆلای کردو پاشان رۆیشت، پاش چەند رۆژێك سەلاحەدین لەوی پرسی وویتان رۆیشتووە دیار بوو لە نێو چەوانیدا گلەیی هەبوو، ووتی چۆن ئەم پیاوە دەڕواو بەجێمان دێڵێ بێ ئەوەی شتێکی پێببەخشین.

دانەری کتێبی (مێژووی جەنگە پیرۆزەکان لە رۆژهەڵات) کە ناوی مکسیموس مونروند دەڵێ: پاش رزگار کردنی قودس لەلایەن موسڵمانانەوە هەموو خاچ پەرستان لە قودس لابران بێ ئەوەی هیچ زیانێکیان پێبگات کەئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردە (سەلاحەدین) کە ناسراو بوو بەوەی کە نەرمو نیان بوو بەرامبەر دوژمنە بەزیوەکەی.

کاتێك کە قودس رزگار کرا، کۆمەڵێکی زۆر لە ئافرەتانی خاچ پەرستان کە شوێنەکەیان بەجێ دەهێشت چاویان بەسەلاحەدین کەوت سەلاحەدین ووتی چیتان دەوێ؟ ووتیان دەمانبینی کەوا ئێمە ئێرە بەجێدێلین، ئێمەش خێزانو دایكو کچی ئەو سەربازانەین کەوا تا ئێستا لەلای



ـن، داواكـار بـوون كـه ئـازاد بكرێـن، ئـەوە بـوو ـەلا ـبن پێ كانيـانی ئـازاد كـرد ئـەوەيش كەســەر پەرشتكاربان كرد بوو ماڵو سامانی پێ بەخشين. گومـانی تێدا نیيە ئـەو ديـدو بۆچوونانـەی كـە مـێژوو نووسـانو نووسەرانو سياسەتمەدارانی ئـەورووپی لايـان كۆبوونەتـەوە، پشت دەبەستێ بە وتەكانی ئەو كەسانەی كە لەســەردەمی ســەلاحەدين ژيـاون لـە موسـڵمانەكانو فەرەنگــە خــاچ پەرستەكان لەمانە (وليم الصوري)و (ارنـول)و (امـبروز). كە بە گەورەترين مێژوو نووسی سەردەمی ناودراست. وليــم بەشداری كردووە لەهێرشی خاچ پەرستیی يەكەم، لــەزنجيرە خێزانێكی فەرەنسیيە لە (بيت المقدس) لەدايك بــووە. زۆر كتێبی داناوە بەناوبنگترينيان ئەو كتێبەبە كە لە ٢٣ بەرگ پێك دێ كەلەبارەی سەلاحەدينی نووسيوود.

لەو ديلانەی كە سەلاحەدين رزگــاری كـردن، كچێكـی فەرەنگی بوو كە تورە بوو هاتە لای سەلاحەدين وتی: ئەی خوێن رێژ بــاوكمت كوشـتو دوو برامـت بـەديل گرتـووە، ئێستا كەسم نیيە بەرێوەم ببا، تۆش ئێستا مننەتم لەســەر دەكەی بەرزگاركردنم كە (بەلا)م زياتر دەبـێ. ئـەم هـەموو جنێوە بەسەلاحەدين دران سەلاحەدين تورە نەبوو، يـەكێكی نارد بۆ ئەوەی هەر دوو بـرای كچەكـە بێنـن بـە كچەكـەی وت: بـاوكت كـوژراوە لـە جـەنگدا كـە ئـەو ئاگرەكـەی هەڵگيرساندوەو دەستدرێژی كردۆتە سەر ميللەتێكی ئەمين لەخاكی خۆيان. بەڵام هەر دوو براكەت ئازاد دەكـەم لەبـەر ئـەوەی كچێـك پێويســتی بەســەر پەرشــتكارێك يــان بەرێوەبەرێك هەيە. لێرەدا كچەكـە وتـی: ببـوورە گـەورەم تورە بوونی من لەغەمو خەفەتەوە بوو، ئەوەی كە گوێـم لێ دەبوو لە وڵاتەكەم لەسەر زوڵـمو زۆری موسـڵمانان وای لێ كردم كە قسە بكەم بێ ئـەوەی ئاگـام لـەخۆم بـێ. لەگـەڵ ئەمەشدا من بێ ئومێد نيم لە لێ بووردەيیو بەخشينی تۆ. كاتێك كچەكە ويستی بڕوا سەلاحەدين پـێ‌ووت: بـۆ كـوێ دەچی؟ ووتی بـۆ وڵاتەكـەم.. سـەلاحەدين پـێی ووت چـی بەميللەتەكـەت دەڵـێی؟ چيـان بـۆ بـاس دەكـەی؟ ووتـی بەرەگەز پەرســتانيان دەڵێـم كـەچيم بينيـوە لـە ئيسـلامو موسڵمانا بەراستی.

(يــەهودا حــەريز)ی شــاعير كــە جولەكەيـــەكی ئيسپانيايیيەو لە ساڵی ١٢١٦ سەردانی قودسی كرد بـوو پاش (٣٠) ساڵ لە ئازاد كردنی قودس دەگێڕێتەوەو دەڵــێ جولەكـە زۆر سـووديان لـــەو كەشــە ئازادیيــە بينـی كەلەسەردەمی سەلاحەديندا بڵاوبووبۆوە، كۆمەڵەيەكی زۆر زۆر لە جولەكە لەهەموو شوێنێكی جيهاندا پـەنايان بـردە بەر (قودس)و هاتنە ئەم شوێنە.

دكتـۆر (البـاز)ی عـەرەب دەڵێـت: (نهێنـی بـەهێزی سەلاحەدين لەبنەڕەتدا دەگەرێتەوە بۆ خۆشەويسـتی خـەلك بـۆ ئـەم سـەركردە). بێگومـان ئـەم خۆشەويسـتیيەش دەگەرێتەوە بۆ رەوشتە بـەرزەكانی ئـەم سـەركردەيە كەلـە ئـايينی پـيرۆزی ئيسـلامەوە وەريگرتـووە. بەراسـتی سـوار چاكــەو لێبووردەيـــیو بەخشـــندەيیو رەوشـــت بـــەرزی سەلاحەدين ئەوەندە بەرز بوو كە هــەموو جيهـان گـەواهی دەدەن بۆی، كە ئەمانــەش هــەر هـەمووی دەگەرێتـەوە بـۆ باوەڕێكی پتەوی سەلاحەدين بە ئايينی پيرۆزی ئيسلامەوە.

جا لەكۆتايیدا پێويستە هەموومان چاو لە كردەوەكانی ئەم كەڵە ســەركردەيە بكـەينو بيكەينـە نموونـە بۆكـاری رۆژانەمان.

**سەرچاوە:**
گۆڤاری (كاروان) بەشی عەرەبی ژمارە (٦٢) ساڵی ١٩٨٨ بەناونيشانی (صلاح الدين في نظر مؤرخية) لەنووسينی د.محسن محمد حسين.









## ئازایەتی و داپەروەری و بەخشندەیی

# عەلی کوڕی ئەبی تالیب

* ئامادەکردنی : بەختیار سەعید شارەزووری *

ئەگەر کەمێک لە مێژووی ژیانی خەلیفەی چوارەمی ڕاشدین ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب - ڕەزای خوای لێ بێ وردبیبنەوە هەر لەسەردەمی منداڵی و گەنجێتی و بگرە تابوونی بە خەلیفەی چوارەمی موسڵمانان کە ناسراوە بە (ڕاشدین) بۆمان دەردەکەوێت ژیانی ئەم مرۆڤە پاک و بێ گەردە پڕە لە ئاڵۆزی و کێشمەکێشی قەیرانی هەژاری و نەداری و دەست کورتی بووە جگە لەوەی سەرجەم سیفات و ڕەوشتی (عیزەت و کەڵنەدان و ئازایەتی و دڵسۆزی و وەفاداری و ئەمین و ژیری و زانستی ) تیا بەرجەستە بووە دەگمەنە مرۆڤ لەسەردەمانی نەفامی تابە ئیسلامەتی و بگرە تابە ئەمرۆ ئەو خورەوشت و سیفاتە بنەڕەتیانەی تیا کۆببێتەوە.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئیمامی (عەلی) یەکەمین نێرینەی سەر زەوی یە کە بووە بە ئیسلام وەک لە چەند ڕیوایەتێکدا دەگێڕنەوەو دەڵێن تەمەنی بلوغی تەواو نەکردووە واتە منداڵ بووە. ناکرێ ئەو ڕاستەیە پەدەر نەخەین بە منداڵی مێشک و بیری وەک مرۆڤێکی گەورە وابووە ئەمەش (سبحانە اللە) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە زۆرترین تەمەنی واتە هەر لە منداڵی یەوە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (د.خ) بەسەر بردوەو ژیاوەو سودو کەلکی زیاتر و بەهرەمەندتری لە پێغەمبەری مەزن (د.خ ) وەرگرتووە.

دیارە نوسینی ژیان و مێژووی ئەم پیاوە مەردە هەرگیز بەچەند دێڕێک و چەند لاپەڕەیەک بگرە بەچەند کتێبێک تەواو نابێ. وا دەزانم ناهەقی یەکی ئێجگار گەورەدەکەم کە بتوانم بەچەند لاپەڕەیەک گشت سیفاتی مرۆڤایەتی و ئیسلامەتی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوالی لێ بێ) تۆمار بکەم. بەڵام مەبەستم بوو (٣) ڕیوایەتی ئەو سەردەمانە بخەمەڕوو کە هەریەکێکیان باس لە سیفاتێکی دیاریکراو دەکات لە ژیانی ئیمامی عەلی خەلیفەی چوارەم دا، گومانی تێدا نی یە یەکەمین ڕیوایە لە ماوەی کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا (د.خ) ڕوویداوە. دەگێڕنەوە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (د.خ) نیازی کۆچ کردنی هەبوو فەرمانی دا (عەلی) لە نێو پێخەفەکەیدا بخەوێ تا دوژمنان وا بزانن پێغەمبەری خوا (د.خ) لەماڵەوەیە، هەروەها تائەو سپاردانەی کەلای پێغەمبەری خوا (د.خ) دانرابوون بە دەست خاوەنەکانیان بگەیەنێتەوە. کافرانیش هەتا ڕۆژیان لێ بوویەوە، چاویان بڕیبووە جێگاکەی پێغەمبەر (د.خ) ئەم سات و ئەو ساتیان بوو تاهەڵمەتی بەرنەسەر. کە ڕۆژ بووە سەرنجیاندا وا (عەلی) تیادا خەوتووە. کە هەواڵی پێغەمبەریان (د.خ) لێ پرسی.

وەڵامی دانێ کە نازانێ لە کوێ یە. بەمە بۆیان دەرکەوت کە لەشار دەرچووە، دوای ئەوە (عەلی) بەو پەڕی دەست پاکی یەوە سپاردەکانی دایەوە دەست خاوەنەکانیان. تا بەو جۆرە ناوی (الامین) ی لێ نرا.

* ڕیوایەتی دووەم لە چۆنێتی بەخشندەیی و سۆزی مرۆڤایەتی ئەو ئیمامە خاوەن دڵ و دەروون دەوڵەمەندەوەیە کە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ لە بارەی فەرمایشتی خوای گەورە **(ویطعمون الطعام علی حین مسکینا و یتیما واسیرا)** وتوویەتی: (عەلی) شەوێک تا بەیانی چوو بۆ ئاودێرانی دارخورما بەرامبەر بەوەی مشتێک جۆی بدەنێ کەڕۆژ



ـووەوە جۆیەکەی وەرگرت و هەندێکی لێ هاڕی و جۆرە ـنێکیان لێ کرد تابی خۆن، کە نانەکە بڕژا هەژارێک هات و داوای نانی لێ کردن ئەوانیش نانەکەیان دایێ و دوای ئەوە سێ یەکی دووهەمیان لێ کرد بەنان کە برژا هەتیوێک هات و داوای نانی لێ کردن ئەوانیش نانەکەیان دایێ و دوای ئەوە بەشی سێ هەمیان لێ کرد بەنان کە برژا دیلێکی بت پەرست هات و ئەویشیان دەرخواردی ئەو دا. ئەو رۆژە خۆیان بێ شێومانەوە. بۆ ئەو مەبەستەش لەو بارەیەوە ئەو ئایەتە پیرۆزەی سەرەوە هاتە خوارەوە.

* ریوایەی سێ یەم یەکێ لەو وتە شیرینەکانی ئیمامی عەلیە (خوا لێ ی رازی بێ). دیارە خوای گەورە وەک لەسەرەتادا باسمان کرد چەند خورەوشت و سیفاتی بە (عەلی) بەخشیوە هەر لە خزمایەتی پێغەمبەر (د.خ) هەتا ئازایەتی و زیرەکی و تەقواداری کە بەجۆرێک خاوەنی پایەیەکی یەکجار بەرز بوو لای خوا و پێغەمبەرەکەی. لەگەڵ ئەو چەمکە سیفاتە چاکانە وتەی شیرینیشی پێ بەخشیووە کە چۆن ئامۆژگاری (ئیمامی حەسەنی) کوری دەکات کە دەبێ دادوەرێکی زۆر عادل و راستگۆو بێ گەرد بێ و هەموو کاتێ جیاوازی نێوان خۆی و مرۆڤێکی دیکە نەکات، وەک ئەوەی دەفەرموێ: کورەکەم! خۆت بکە بە تەرازوویەک لە نێوان خۆت و کەسانی تردا، ئەوەی بۆخۆتت دەوێت بۆ کەسانی تریشت بوێت ، هەروەک حەز ناکەی ستەمت لێ بکرێت. وەهاش ستەم لەکەس مەکەو، هەروەک پێت خۆشە چاکەت لەگەڵ بکرێت وەهاش چاکە لەگەڵ خەڵک دا بکە. هەروەک رەفتارێک کە بەخەڵکەوە بێت بەلاتەوە ناشیرینە ! گەر بە خۆشتەوە بوو بە ناشرینی بزانە، هەروەک کارێک کە خۆت ئەنجامی بدەیت رەزامەندیت لەسەر ی هەبە گەرخەڵکیش ئەنجامیان دا بارەزامەندییت لەسەری هەبێت. هەرچی نازانیت مەیڵێ گەرچی کەم بزانیت. ئەوەش کە پێت ناخۆشە پێت بوترێ، تۆش بە خەڵکی مەڵێ.. دوای ئەوەی کە خوا بەسەربەستی دروستی کردویت، خۆت بە بەندەی هیچ کەس مەکە. ئەوەش بزانە کە پارێزگاری ئەوەی وا لەدەستتت دا، بەلامەوە خۆشەویستترە لە هەوڵدان بۆئەوەی کە وا لەدەستی کەسانی تردا. هەر خۆراکێکیش مافی خۆتی پێوە نەبێت لێی مەخۆ. چونکە خۆراکی حەرام خراپترین خۆراکە.. هەوڵ بدە ژیانی خۆت بەدەست بهێنی و هەرگیز نەکەی پشت بە ئاوات و ئارەزوو ببەستی. چونکە ئەوە دەست مایەی مردووانە و پیشەکارییش لەگەڵ داوێن پاکی چاک ترە، لەدەوڵەمەندی لەگەڵ شەرواڵ پیسی دا.

بەڵێ ئابەم جۆرە بۆت دەردەکەوێت کە ئیمامی عەلی بەم وتە شیرینانە چۆن سەرجەم سیفاتەکانی کە باسمان کرد ئابەو جۆرە بە نمونەی گچکە رووبەرووی کوڕە گەورەکەی ئیمامی حەسەن دەکاتەوە کە نەبا خۆی لە بیر بکات و لەیاسا و ئەحکامی ئیسلام لابدات، پێم وایە ئەوەی ریوایەی سێیەم بە بیرومێشکی بێ گەردەوە سەرنج بدات هەرگیز تووشی ئازارو ئەشکەنجە و رەش بینی نابێ بەتایبەتی لە رۆژی قیامەت دا، چونکە ئەوەی مرۆڤی ئەمرۆ چ بە چاکە هەڵسێ یان بە خراپە پاداشت لە قیامەت وەردەگرێ و لەم دنیا تەنها ناوی چاکەیەو ئیشارەتی بەئاگابوون لەخوای گەورە بەدیاردەخات. ئەگەر چاوێک بە تەمەنی منداڵی ئیمامی عەلی دابخشێنین دەبینین کە(٣) ئازناوی جوانی لێ نراوە. یەکەمیان (ابو الحسن) دووەمیان (ابو الریحانتین) سێ یەمیان (ابو تراب) ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەگەرێتەوە بۆ پاکی و ژیری و دڵسۆزی و خۆشەویستی و وەفاداری کە بەمنداڵی ئەم سیفاتانەی تیا کۆبۆتەوە لە تەمەنی گەنجیشیدا ئازایەتی و دادوەری و تەقواو بەخشندەیی و ئەمینی تیا کۆبووبوەوە ئا بەم چەشنە مرۆڤ کە یاداشتی مێژووی و ژیانی ئەم پیاوە بێ گەردە (عەلی کوری ئەبی تالیب) (رەزای خوای لێ بێ) دەخوێنێتەوە هەست بە بوونی خۆت و چواردەورو یاساکانی ئیسلامەتی دەکەیت، کە پێویستە حاکمی ولات دادوەرێکی سالح بێ و وولات بەرەو فەسادی و گەندەڵی ئیداری و کۆمەلایەتی و بگرە ئابووریش نەبا، چونکە خوای گەورە جیاوازی ناکات لەنێوان موسڵماناندا تەنها بە تەقوا کردن و پیادەکردنی رێساکانی ئیسلام پلەی ئیمانداری دەبەخشێتە مرۆڤ نەک بەدەسەڵاتی کاتی سەرزەمین. بە ئومێدی ئەوەین سودو کەڵک لە مەعریفەو زانست و خورەوشتە جوانەکانی (ئەمیر مؤمنین) وەربگرین و بۆ بەرێ کردنی ژیانی سەرزەوی کۆچ کردن بەرەو دنیای قیامەت و فەنا بوون هەڵبژێرین.



# نوسراوێک لە لایەن ئیمامی مالیکەوە بۆ خەلیفەی ئیسلام هارونە رەشید

## بەشی یەکەم

وەرگێرانی : عصام الدین ملا طیب گەردی

سوپاس بۆئەو خودایەی کەوا بە خێوکەری هەمووگیانلەبەرێکە رەحمەت و بەزەیی بۆ سەر پیرۆزترین پێغەمبەر کە زاتی (محمد) و ئال و یارانی بەکۆمەڵ: پاشان نوسیم بۆ تۆیە نوسراوێک کەم وکوڕیم نەکرد وە لە ڕێگا نیشان بدات. هیچ ئامۆژگاریەکم پەنهان نەکردیە ئەوەش سوپاس داریەبۆ خودا نێردراوی خوداکە: محمد **(علیه الصلاة)** بە عقلی خۆت بیری لێ بکەوە بەچاو بڕوانە گوێی لێ ڕابگرە بە دەرونێکی پاکەوە هەستی لێ ڕابگرە ئامادەی نیازت بکەو خۆت بەهیچ لایەک خەریک مەکە ئەگەر وا بکەی بەڕاستی سەر بەرزیە لە دونیاو پاداشتی چاکەیە لە کۆتایی سەرزەنشتی خۆت بیر لە خۆت بکە بۆ نزیک بونەوە لە مردن و ناخۆشیەکەی لەوەی کە بە هۆی وی دێتە سەرت و هەردەبێ بێتە سەرت کە ڕاگرتنە بەرامبەر بە خودا پاشان لێ پرسینەوەو مانەوەی یەک جارەکی پاشی لێ پرسینەوە ئەنجامی (ئامادە بکە بۆ خوداوەند بۆ ئاسان بونت لەو هەموو ناخۆشی دەربازبوی ئەگەر بێت و ببینی لەکەسانی حاسێبوان چ عەزابێکی جۆراوجۆر دژوار گوێت لەناڕەیان لەناو ئاگری دۆزەخ بەهۆی شەرمەزاریەوەو ئالۆزی روخسارو ئەو ماوە درێژە غەمناکیە بێ کۆتاییە، گۆڕینی عەزاب لەسەریان بەدژوارترو ئازار لەدوای ئازارو نەبیستن ئاواتی باش و نەگەیشتن لەدەرچوونی ناخۆشی داخ و پەشیمانی لەسەر کارەساتە کەرۆژی ناخۆشتر خوا لێیان توڕەیەو ئومێدی لێ خۆشبونیان نییەو هیچ گرفتارێکیان لێ دەرناگیرێ و لێیان قەبوڵ ناکرێ ماوەی ڕەنجەڕۆییان بێ ماوە **(اخسئوا فیها ولاتکلمون)** ئەگەر مەبەستی دەربازبوونی ئاگری دۆزەخت هەبێ بەهیچ گەورەیەکی ئەو دونیایە لەخۆت بایی مەبە ترسی مردن فەرامۆشت نەکا ئەگەر بت دیبوایە بۆ قوتار بونت لەو ڕۆژە سەختەیە هەموو موڵکی دونیات دەبەخشی و بەشتەکی کەمن دادەنا بەرامبەر لێ بووردنت ئەگەر بینی ئەو کەسانەی کەوا خودا چاکەیان لەگەڵ دەکا خاوەن ڕێزن و، نزیکن لەخواوەند رویان گەشە ئۆشاذێکی ڕێز لێ گیراو نۆشین و سەیریان بکەی جێگای ڕێز لێ گیراویان ببینی ئەو شێوە دیاردە ڕێز لێ گیراویە ببی یەکسەر ئەوەی پێت گەورەیە کردیتە قوربانی بەرامبەر شتێکی بچوکی بەهەشت کەخودا پێت ببەخشێ - لەپێش چاوت بچوکە ئەوەی کەوا لەجیهانییە کەمە گەورەیە: ئاگاداری خۆت بکەو لەخۆت بایی مەبە بەخۆت دابچۆوە پێشی ئەنجام دانی کارەکە هاتنی کاتی مردن نەترسێنێ و ناخۆشیت بۆ دروست بکا بەخۆت بوەستە لەکاتی فەرامۆشی و پێی بوێرە چونکە دەتوانێ ئەگەر خودا ڕێت بداو بۆت بکا سودو دەست بێنی ببیە خاوەن نیشانەو بەڵگەی سودبەخشی پێش ئەوەی لێت بپرسێتەوە دوایی هەر خراپەکی بەسەرت بێ ناتوانی لەخۆتی دور بخەیتەوە بەهێزو بازووی خۆت هەوڵ بدە بۆ خۆت بەشێك لەشەو بەشێك لەرۆژدا دوازدە ركعەتی سوونەت چۆنی پێت باش بوو لەدوای سورەتی (فاتحە) بخوێنە یان ئەگەر ویستت هەموویان پێکەوە یانیش ویستت جیاجیا بێ چونکە پێم گەیشتووە لەخۆشەویستەوە دەفەرمووێ **(من صلی من النهار اثنتی عشرة ركعة بنی الله له بیتا فی الجنة)** وە هەروەها لەکاتی شەودا (٨) ركعات بەهەمووی بتوانی یەك (جزء)



نەدوای سورەتی (فاتحە) بخوێنەو هەر رکعەتێك بەتەواوی حەقی خـۆی بـۆ دابـین بکـە لەتــەواوی (رکـــوع) و (سجود) جۆت جۆت نوێژەکە ئــەنجام بدە چونکە لەلایەن پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە دەفـەرمووێ (أنـه كـان يصلي من الليل ثمان ركعات والوتـر ثلاث ركعات سوى ذلـك يسـلم مـن كل اثنتين) لەهەر مانگێك (٣) رۆژ بـەرۆژی بــە (١٣) و (١٤) و (١٥) (ذلك صيام الدّهـر) زەکـاتی مـالی خۆت بدە کەسالی بەسەردا سوڕایەوە چونکە ئەنجامی خاوێن بوونەوەی ئەو رزقــە کـەخوداوەند پـێ بەخشـیوی مەیهێڵـــــە دواو تــــــەنها لەموسـڵمانانیمیللەتەکەت بەشــی کە لەپێغەمبەرەوەی پێــم گەیشــتووە دەفـەرمووێ **(إنّ ا للـه لـم يـرض مـن الصّقة بحكم نبّي ولاغيره حتى حدّها هو على ثمانية أجزاء "انما الصدقات للفقــراء والمســاكين والعــاملين عليها والمؤلّفة قلوبهم وفي الرّقـاب والغارمين وفـي سـبيل ا للله وابــن السبيل)**. باشـترین مـاڵ و خـاوێن تربـن مـاڵ چیەنەوە ئامادە بکـە بـۆ مـاڵی خـودا چونکـە تـەنها مـاڵی خـاوێن خـودا قبوڵـی دەکـا **((فمـن تعجل في يومـين فـلا إثـم عليـه ومن تـأخر فـلا إثـم عليـه))** مایـەی لـێ خۆشـبونە بـەردەوام بـە لەسـەر خـوا پەرستی رابگەینەو نەفرەت لەکاری خراپ بکـە، لـە پێغەمبـەرەوە پێـم گەیشتووە **((مـروا بـالمعروف وانهـوا عـن المنكـر فانمـا هلـك مـن كـان قبلكـم بـتركهم نهيهـم عـن المعـاصي ولـم ينهـم الربـانيونّ والاحبـاد))** بـە بیرو بۆچونـی چاکـەو دوور کەوتنەوە لەخراپە پێش ئەوەی وەک وگەلانی پێشومان بەسـەر بـێ چونکە ئـەنجام دانـی ئـەم کـارە خـۆ مـردن نزیـک تـر ناکاتـەوە لەمۆڵـەتی خۆی وەرزقیش نـابری ئەوکەسـانەی ەوا بەسەریان دا زاڵی چاکەیا لەگەڵ بکە شوکری ئەو گەرەییە بکەکەخودا لەگەڵی کردی بەرامبەر ئەوکۆمەڵـەی لـە ژێر دەسـتت دایە پێم گەیشـتووە خۆشەویسـت **((عليــه الصــلاة))** دەفەرمووێ **[[انـه كان يصلي فـأنصرف وقـال أطت السماء وحق لها ان تئـط مافيهـا موضع اربـع اصابـع الا عليـه جبهة ملك ساجد فمن كـان لـه حـول فليحسن اليـه ومـن كـره فليسـتبدل ولا تعذبـوا خلق اللـه))** ئـەدەب بـەو کەسە نیشان بـدە کـە کـاری بەدەسـت تۆیـە و چاوەڕێ فـەرمانی تۆیـە پێـم گەیشتووە لەلایەن خۆشەویستەوە کە فەرموویـەتی بـۆ **((فـه ضلـي كـوىي ئيمامي عباس)) ((لاترفع عصاك عن أهلك وأخفهم فـي اللـه))** بەرللـەی خەڵـک مەکەو گرنگی کاری خـەڵکی وەلامـەنێ خـۆت بکـە بـاڵ بەسـەر کۆمـەڵی ژێـر دەسـتت، لەلایـەن خۆشەویستەوە بۆم گێڕدراوەتەوە کـە فەرموویـەتی **((ألا احدثكـم بوصيـة نـوح أبنـه قـال: آمـرك بـاثنين وأنهاك عن أثنين، آمرك بقول لا اله الا الله، فأنهـا لـو كـانت فـي كفـة والسموات والارض في كفة وزنتهـا ولو وضعتها على حلقة قصمتها، وقل: سبحان الله وبحمده فأنهـا عبـادة الخلق وبها تقطع ارزاقهم فأنهما يكثران لمن قالهما الولوج على الله عز وجل وأنهاك عن الشرك والكبر فأن الله محتجب عنها فقال له بعض أصحابـه: أمن الكبـر فـان اللـه لـي الدابـة النجيبـة؟ قـال لا. قـال: أمـن الكبر أن يكـون لـي الطعـام أجمـع عليه النـاس؟ قـال: لا. إنمـا الكبـر ان تسفه الحق وتغمص الخلق ، وايـاك والكبر والزهو فأن الله عـز وجـل لا يحبهمـا.))** بـۆ گێڕدراوەتـەوە، لــە هەندێک زاناوە **((يحشر المتكبرون يوم القيامة في صور الـذر تطؤهـم النـاس بتكبرهم على اللـه عز وجل))** قـەت لــە پیـاوی خوانـەترس بـێ ئاگامەبـەو لێـی هوشـیاربە چونکـە عومـەری کوڕی خـەتتاب دەفـەرمووێ **((شاور في أمرك الذين يخافون الله احـذر بطانــة الســوء))** ئاگـاداری پیـاوی خـراپ و کەسـی پـوچ بـەو لـە خۆتیـــان دوور بخــەوە، لــــە خۆشەویســـتەوە پێـــم گەیشـــتووە دەفەرمووێ **((مامن نبـي ولا خليفـة إلا ولــه بطانتـــان بطانـــة تـــأمره بـالمعروف تنهـاه عـن المنكـر وبطانـة لا تـألوه خبالا وهـو مع التـي أسـتولت عليـه و مـن وقـي بطانـة السوء فقد وقي))**، پیاوی لە خواترس جێگـای بۆدابـین بکـە، رێـز لـەمیوان بگـرە چونکـە لەسـەرتە رێـزی میـوان بگـری، چـاودێری جیـران بەشـتی چاکـەو لابردنـی ئـازار لەسـەری، چونکـە لـــە پێغەمبـــەرەوە پێـــم گەیشـتووە دەفـەرمووێ **((مـن كـان يؤمـن باللـه واليـوم الاخـر ليكـرم ضيفـه))** دوانـت تـەنها لـە چاکـە بـێ ئەگـــەر نـــابێ دەنگـــی چونکـــە **نصفةمبـــة ر ((عليـــه الســـلام))**



دەفەرمووێ **((من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا، أو ليصمت))** خۆت بپارێزە لە گۆتە گۆت چونکە لە عبدللە کوڕی مسعود دەگێڕنەوە **((انذركم فضول النطق وأكرم من وادك وكافئه بمودته وإياك والغضب في غير الله لا تأمر بخير الا بدأت بفعله ولاتنه عن سوء الا بدأت بتركه))** خۆت ماندوو مەکە بەو شتەی کەوا سودی تۆی نی یە، چونکە لەخۆشەویستەوە بۆم گەڕاوەتەوە دەفەرمووێ **((من حسن اسلام المرء تركه مالايعنيه))** سەردانی ئەو کەسە بکە کەوا نایێتە لات ئەو کەسەی زۆرداری لێ کردی لێ ی خۆش بە، ببەخشە بەو کەسەی بێ بەشت دەکا لەماڵی خۆی، چونکە پێغەمبەرە بەوە داینەوە **((إنما أفضل أخلاق الدنيا والآخرة))** زۆر پێ مەکەنە چونکە دەتگەیەنێتە بێ ئاگایی چونکە خۆشەویست دەفەرمووێ **((اني لأمزح ولا أقول ألاحقا))** ئەوەی کە خوداوەند ڕێ ی پێ نەداوە بێ فەرمان بۆ لامەکەو درێژی زۆربە قسەکردن، لایەن خۆشەویستەوە بۆم گێڕاوەتەوە **((وهل يكب الناس في نار جهنم الا هذا))** واتە زمان هەرگیز بەلاق و کەلازاف ڕووی خۆت لە خەڵک هەرمەچەخێنە خۆم بابێگانە دۆست یا دوژمن ڕوو خۆشی ناسکی و نەرمی بەکاربێنە لە پێغەمبەرەوە بۆ گێڕاوەتەوە **((أن أهل الجنة كل هين لين سهل طلق))** کاری پەنهان لابەرە بە شێوەیەک بۆ تۆ جوان نەبێ هەرچی تاوانبارت بکا لە دین یان لە دونیا خۆتی لێ دووربگرە **((من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يقف مواقف التهم))** بەدوای داوای شت و خوازۆک مەبە چونکە دڵ گرانی تێ ڕایە پێغەمبەر بۆ پیاوێک گێڕاوەتەوە دەفەرمووێ **((لا تسأل الانسان وليكن مجلسك بيتك أو مسجدك))** خۆشەویست فەرمووی **((المساجد بيوت المتقين، سنة مجالس المسلم ضامن على الله ماكان في شيء منهن في سبيل الله أو في بيت الله أو في عيادة مريض أو شهود جنازة أو جمعة أو عند امام مسقط يعزره ويوقره))** ڕەوشت بەرزی بەکار بێنە لەگەڵ خاو خێزانت و ئەوەی بەتۆ سەرفرازە چونکە مایەی ڕەزامەندی خوداو خۆشەویستی کەسانت و بەری درەخت بەرهەم دەدا لەهەندێک زانا لەیارانی خۆشەویست **((أحسن البشر الى عامة الناس وأتق شتمهم وغيبتهم))** خودای بەرزو بە توانا دەفەرمووێ **((ايحب احدكم ان يأكل لحم أخيه))** خۆت بپارێزە لە پیاوی بێناموس و پیاوی گەندەو پیاوی پرو پووچ گفتوگۆی پیاوی وا مەکە. لە پێغەمبەرەوە بیستوومە **((اعتبروا الناس بأخدانهم فأنما يخادن الرجل الرجل مثله))** چاودێری بێ باوکان و بەزەیی پێ هاتنەوە **((من كفل يتيما له أو لغيره كنت انا وهو في الجنة كهاتين وأشار بأصبعيه فضمهما))** مافی ڕێبواران بدە ئامۆژگاری خودای بەسەر دابنوێنە چونکە زانیومە یەکەم کەس کەوا میوانداری کردوە ((ابراهيم الخليل)) بووە پشت گیری زۆر لێکراوان بکەو سەریان بخە لەوەی پێت کرا دەستی ستەمکاران بگرە مۆڵەتی زۆرداران مەدە چونکە خۆشەویست دەفەرمووێ**((من مشى مع مظلوم حتى يثبت له حقه ثبت الله قدمه يوم تزول الاقدام))** ئەو کەسانەی پیاوی هەوەس کەسانی ڕێگای ڕاستیان ون کردیە خۆت لێیان دوورە پەرێزبگرە. لە خۆشەویستەوە زانیومە **((إني أخاف عليكم اثنتين اتباع الهوى وطول الامل))** پیاوی هەوەس باز ڕێگای ڕاستی ون دەکاوە ئەوەی بە هیوای ژیانێکی زۆر ڕۆژی دوایی لە بیر دەکا خەڵک ماندوومەکە و مەیان گێڕەو ئینساف بەرامبەر یان بەکاربهێنە **((اشرف الاعمال ثلاثة ذكر الله على كل حال و مواساة الاخ من المال و انصاف الناس من نفسك))** چاو مەگێڕە لەوەی کەوا خودا حەرامی کردووە چونکە لەئیمامی (عەلی) یەوەبۆم گێڕدراوەتەوە دەفەرمووێ **((لا يتبع النظرة النظرة فانم لك النظرة الاولى وليست لك الاخرى اتق المطعم الوبي والمشرب الوبي والملبس الوبي فأن ذلك تذهب انفقته))** خودای گەورە بە پێغەمبەران ڕادەگەیێنێ **((كلوا من طيبات وأعملوا صالحا))** پێغەمبەر دەفەرمووێ**((من أكل بأخيه المسلم اكلة اطعمه الله مكانها أكلة من نار ومن سمع بأخيه المسلم سمع الله به يوم القيامة ومن لبس بأخيه المسلم ثوبا ألبسه الله مكانه ثوبا من نار))** ئەو کەسەی داوای



سەرزەنشتت لێ دەکا لێی وەرگرەو بگەڕێتەوە لەوەی کەوا پێت ناخۆش بووە چونکە لە خۆشەویستەوە پێم گەیشتووە **((من اعتذر الى اخيه المسلم فلم يعذره كان عليه مثل وزر صاحب مكس))** دەستی دەستەڵاتدار بەسەر هەموو کەسێک کەتێکەڵاویت دەکا چونکە لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((اليد العليا خير من يد السفلى))** واتە برادەراتی باشترین کەس بکە چونکە یارمەتیت دەدەن لەسەر گەیاندنی فەرمانی خودا لەخۆشەویستەوە پێم گەیشتووە**((ما تحاب رجلان في الله الا كان أفضلهما اشدهما حبا لصاحبه))** بیگەینە بەزیت تەماشای چاکەی بەرامبەرت مەکە باوەکو نێتە لاشت پیاوێک لە پێغەمبەری پرسی **((إن لي اقرباء أعفوا ويظلموني وأصل وقطعوني وأحسن وسيئوني افأكافئهم فقال (صلى الله عليه وسلم)) إذن تتركوا جميعاً ولكن اذا أساءوا فأحسن فأنه لن يزال لك عليهم من الله ظهير))** بەزەیی بەرامبەر بێ دەرمان داران و پیاوی بێ چارەو توانا بەو پەڕی دڵسۆزیەوە بۆیان لە (ابن عباس) )ەوە، بۆم گێڕاوەتەوە **((كل معروف صدقة ارحم السائل وارده من بابك بفضل معروفك بالبذل منك أو قول معروف تقوله له))** چونکەخۆشەویست دەفەرمووێت **((ردعنك مذمة السائل بمثل رأس الطير من الطعام))** نەشتی باش مەپەنگێتەوەوە بەباشیش نەزانی ئامانجی چی یە **((لا تزهد في المعروف لو ان تطلب ثم دلوك في اناء المستقل))** بە بازووی بێ وچانی یارمەتی کەسانی خواویست بدە چونکە لەپێغەمبەر پێم گەیشتووەلە کاتی خوێندنەوەی ئایەتی**((فويل للمصلين الذين هم)) الآية قال: المنافق الذي من صلى راءى وان فاتته لم يبلغ اليه )) (( ويمنعون الماعون)) قال : الماعون: الزكاة التي فرض الله عز وجل)).** خۆت بپارێزە لە ڕیا چونکە هەروەها پێم گەیشتووە **((انه لا يصعد عمل المرائي الى الله عز وجل ولا يزكيه ان استطعت ان تعمل بعمل ما عملت فيها بينك وبين الله فافعل))** چونکە لەپێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((نضر الله امرأ سمع مقالتي فوعاها حتى يبلغها غيره، فرب غائب أحفظ من شاهد، ورب حامل فقه غير فقيه))** دەروونی پیاوی موسڵمان قەت بێ ئاگانابێ لەسێ شت، لە کردەوەی باش لە پێناوی خودا ئامۆژگاری گەورانی دادپەروەرو کۆمەڵی موسڵمانان و چونکە ئەوان هەموو دەروازەیەک کۆدەکاتەوە خۆت بپارێزە لە ڕەوشتی خراپ چونکە داوات لێ دەکا لە خودا عاسێ بێ و فەرمانی ئەوبکەی **((خياركم أحسنكم اخلاقا))** کەبیرت لە کردەوکانت کردەوە ملکەچ بە خۆت زەلیل بنوێنە بەرامبەر بە خودا چونکە لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە دەفەرمووێ **((ان ملكا اته فقال : ان ربك يقرئك السلام ويقول : ان شئت اجعلك ملكا نبيا أو عبدا نبيا؟ فأشار اليه جبريل عليه السلام تواضع، فما أكل متكئا حتى مات))**

زۆرداری لە خەڵک مەکە چونکە خودا لیێت تێک دەدا. چونکە لە هەندێ زانا لە یارانی پێغەمبەر دەڵێن **((ما ظلمت أحدا أشد على ظلما من أحد لا يستعين على الا بالله تعالى))** زۆر ئاگاداری ئەوەبە هەڵمەگەڕێیەوەو، خاوەن بڕیاری تایبەتی مەبە چونکە تۆڵە سەندنی زۆر نزیکە، لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((ان اعجل الخير ثوابا صلة الرحم، وان اعجل الشر عقوبة اليمين الغموس تترك الديار بلاقع))** سوێند بێجگە لە خواوەند زیاتر بەکارمەهێنە لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((لا تحلفوا بآبائكم ليحلف حالف بالله او ليسكت))** وە هەوەها سوێند بۆ هەموو شتێک بەکارمەهێنە **((لا تجعلوا الله عرضة لايمانكم))** بەزەیی بەرامبەر خەڵک بەکار بێنە **((من لا يرحم الناس لايرحمه الله))** خۆشەویستی خوداو پێغەمبەر خوداپەرستیت بۆ زیاد دەکاو لای خەڵکیش خۆشەویستر دەبی **((قل ان كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله))** قال عليه السلام **((ان الله جعل قرة عيني في السجود))** هەندێک لە زانایان فەرموویانە **((ما أسر عبد قط سريرة خير الا البسه الله تعالى رداءها))** پیاوێکی هێمن تایبەتمەندی لەگفتوگۆ لەدانیشتن سواریدا چونکە لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((انه قال والناس يزحفون حوله))**، **((عليكم بالسكينة))** ئەو وڵاخەی بۆ سواری بەکاری دەێنی ماندووی مەکەو



حەقی خۆی بدەرێ **((اذا ركبتم هذه الدواب العجم فأعطوها حظها من الارض))** ئەوەی کەوا کێنەک بەرامبەری هەیە تۆ لەگەڵی نەرم و نیان بەو لەسەرخۆ بەدوای ئەوە مەگەڕێ ئەزیەتی دابێ ئیمڕۆ تۆڵەی لێ بستێنی خۆت بێینە ڕیزی ئەو لێ بوردن مایەی گەورەییە لە دونیاو لە قیامەت لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((ان الله يحب الحليم الحيي العفيف المتعفف))** هەر خراپەیەکت بینی چاکەیەک لە بەرامبەری دابمەزرێنە **((ايها السلمي اتق العقوق وقطيعة الرحم فأن في ذلك شيئاً في الدنيا وتباعدا في الاخرة)) فانه بلغني عن عن النبي ((اشتكت الرحم الى الله عز وجل ممن يقطعها، فرد الله عليها: اما ترضين ان اصل من وصلك واقطع من قطعك))** هەر توڕەیەک لە هەر کارو کردەوەیەکدا هاتە سەر بیر لە پاداشتی خودا بکە کەوا **((والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس))** لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((ما أمتلأ رجل غيظا فكظمه لله الا ملاه الله رضوانا يوم القيامة))** هەر پەیمانێکت بۆ پەرستنی خودا بەست پاشگەز مەبەوە هەر گوفتارێکت ڕەزامەندی خودای لەگەڵ دابوو بەردەوام بە لەسەری وەفا بنوێنە **((من تكفل لي بست اتكفل له بالجنة، اذا حدث لم يكذب، واذا وعد لم يخلف، واذا أئتمن لم يخن، وغض بصره، وحفظ فرجه، وكف يده))** هەر کاتێک سوێندت بەکارهێناو خودا پەرستی تێدا نەبوو ئەوە سوێندەکە بە گرنگ مەزانە (کفارە)ی لێ بدا. **((لا نذر في معصية الله وكفارتها كفارة اليمين والنذر يمين. واذا حلفت على اليمين ثم رأيت غيرها خيرا منها فأت الذي هو خير وكفر عن يمينك))** چونکە لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە وای فەرمووە (( زۆر خۆت بپارێزە گۆتە گوێت یان قسەیەک بکەی بزانی نابێ )) **((ثلاثة لا ينظر الله اليهم يوم القيامة الامام الكذاب، والعائل المزهو، والشيخ زان))** چاکە لەگەڵ دایک وباوک بکە لە هەموو نوێژێک دوعایان بۆ بکە سەرەتای دوعایەکەش لە خۆتەوە دەست پێ بکە چونکە ((ابراهیم)) علیه السلام **((رب اغفر لي ولوالدي))** چونکە خۆشەویست ((علیه السلام)) دەفەرموێ **((من سره ان ينسأله في عمره، ويزداد في رزقه فليتق الله ربه، وليصل رحمه))** سوپاسی خەڵک بکە ئەگەر خێرو سێری ئەوانت بۆ هات ئەگەر تواناشت هەبوو چاکەیان لەگەڵ بکە. وەکو وەڵامی سەلام **((من لم يشكر الناس لم يشكر الله))** هەر کاتێک پێت هەڵگرت بۆ سواری بڵێ **((بسم الله))** کە بویتە سوار بڵێ **((سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين))** چونکە پێم گەیشتووە خۆشەویست **(عليه الصلاة)** وای کردوە لە هەموو خواردن و خواردنەوە دا ناوی خودا لە سەرەتاوە بێنە ئەگەر لە یادت لە ناوەڕاست ئەگەرنا لە کۆتایی **((تذكر اسم الله حين تذكر فأنه يحول بين الخبث وبين ان يأكل معه وينتقيأ ما أكل))** لەکۆتایشدا بڵێ **((الحمد لله الذي اطعمنا وسقانا وجعلنا مسلمين))** ئەوانە کردەوەی پێغەمبەرن ئەگەر کەسێک خواردنی هەردوکتان لە لای ڕاستەی خۆتان دەست پێ بکەن. لە ناوەندی خواردن مەخۆن لە پێش هاوبەشەکەی خۆت مەیخۆ **((اذكر اسم الله وكل مما يليك))** ڕاستە بەکاربێنە لە خواردن و خواردنەوە نەک دەستی چەپە **((وكل بيمين لا تأكل بشمالك ولا تشرب بشمالك))** چونکە لە پێغەمبەرەوە پێم گەیشتووە **((انما أكلة الشيطان))**.

تاکو دەتوانی هەر ڕۆژی پێنج شەممە سەفەر بکە چونکە خۆشەویست بەردەوام لەو ڕۆژە سەفەری کردوە. هەر ناخۆشیەکت هاتە سەر بڵێ **((يا حي يا قيوم برحمتك استغيث))**. خۆت بپارێزە لەو کەسانەی قسە دەبەن و دەبەن (نمام) **((ملعون من لعن اباه ملعون من لعن امه ملعون من غير تخوم الارض ملعون كل هقار) وهو النمام.** شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ شتێکی خراپەو پێغەمبەر **((عليه الصلاة والسلام))** پێی ڕازی نیە **((من جر ثيابه خيلاء لم ينظر الله اليه يوم القيامة))**. بە دوای خەڵک مەڕۆ بۆ گوناهکاری **((لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق))** ، برسیەتی و هەردەردو بەڵایەک هات سێ جار بڵێ **((الله ربي لا اشرك به شيئاً))** ، بەرامبەر هەموو خەم و پەژارەیەک ئارام بگرە **((انما يوفي الصابرون اجرهم بغير حساب))** ئارام گرتن لە



ـەوی باوەڕدایە وەک ئەندامێکە لـە ـەش کابەری مەکە هەرچـەندە تـۆ ڕاستیش بـی((**ا ! رفـث ولا فسوق ولا جدال في الحج**)) انه المراء.

هەر کارێکت هاتە پێش بیر ـە ئەنجامەکەی بکەوە ((**اذا هممـت بـأمر مـن امـور الدنيـا ففكـر فـي عاقبتـه فـأن كـان رشدا فأمضه وان كـان غيـا فانتـه عنـه**))، قـەت بـەو شـێوە خـۆت ڕوت مەکـەوەو وەکـو پەنجە با لـە کاتی بەجێ گـەیاندی پێویستیش بێ دەبێ شەرم لـەخودا بکەی ((**لا احب ان يلي لي شيئاً من لا يستحي مـن اللـه فـي الخلاء**)). لــە (حمام)یش شتێکت هەر لەبەردابێ باوەک وتـەنهاش بی تـا دەتوانی بە تەنها بە ئەگەر نەتوانی چاو مـەگێرە لەخـەڵک لـە پێغەمبـەرەوە پێـم گەیشتووە(( **لا يحل لامري يؤمـن باللـه واليـوم الاخـر ان يدخـل الحمـام الا بـأراز**)) گرنگی بدە بـەوە تـۆ یەکـەم کـەس بەسـەلام لـە خـەڵک بکـەی، چونکـە ئـەو گەورەییـە بـۆ خـۆت دەگەڕێتەوە وە لـە ئیبن و مەسعودەوە بۆم گێڕدراوەتـەوە ((**السلام اسم مـن اسماء اللـه وضعـه فيكـم فافشـوه فيكم فـان الرجل اذا كتب لـه عشر حسنات**)).

چاودێری منداڵان و ئەوانەی گوێ ڕایەڵتن و بـە گوێت دەکـەن بـەو شێوەی خۆت لەسەری وایان فێربکـە ئەگـەر وات کــرد ئــەوا دەبنـــە پشتگیربت بۆ خواپەرستی لـە ئیبن مسـعودە بـۆم گێڕدراوەتـەوە ((**كـل مؤدب يحب ان يـأخذ بأدبـه وان ادب اللـه هوالقـران**)) هـەر کەسـەک پرسـی کـردی دەتوانـی وەڵامـی بدەیتـەوەو دەتوانـی وەڵام نەدەیەوە ((**المستشار بالخيـار ان شـاء تكلـم وان شـاء سكت**)) پـەنهانی خـەڵک ئاشـکرا مـەکە چونکـە سـپاردراوێکە لای تـۆ مـەیدرکێنە تەنها ئەگەر خێری دونیاو قیامــەت و ئامۆژگــاری خـــەڵکی تێدابوو ((**من حق المسلم على المسلم اذا اسـتنصحه ان ينصحــه**)) هــەر زانســتێکی فێــری بوویــت لـــە خواپەرستی بـە کـاری بینـە نـەرم و نیـان و سـەربەرزبە ((**العلمـاء ورثـة الانبيـاء**)). هەر نوسراوێکت بۆ هات وەڵامی نوسراوە بـدەوە وەک وەڵامـی سـەلام ((**واذا حييتـم بتحيـة فحيـوا بأحسن منها او ردوها**)) ئیبنو عەباس ڕەزای خـودا لەهـەردووکیان بـێ دەفـەرموێ ((**اری رجع الكتـاب على حقا. كما اری رجع السلام**))

شـەرم بـەکار بێنـە چونکـە ڕەوشـــتێکی ئیســــلامە لــــە پێغەمبـــەرەوە پێـــم گەیشـــتووە ((**الكـل شـيء خلـق وخلـق الاسـلام الحيـاء**))، هـەر کاتێکی گەشتت کـرد بڵێ ((**اللهم انـي اعوذبـك من وعثـاء السـفر وكابـة المنقلـب ودعـوة المظلـوم وسـوء المنظـر فـي الاهـل والمـال والحـور بعـد الكـور**)) لــە پێغەمبـەروە وام پێگەیشـتووە بـۆ گەشت وای فەرمووە ئاگاداری پیاوی بێ دەسەڵات بە زۆرداری لـێ نـەکرێ و ئەو کەسەش تەنها پشتت بە خواوە دەبەســتی لەپێغەمبــەرەوە پێـــم گەیشـتووە ((**ثلاثـة لا تـرد دعوتهـم الامام العـادل والصـائم حتـى يفطـر ودعوة المظلوم بأنهـا تصعـد فـوق الغمام فيقول الله لها وعزتي وجلالي لانصرنـك ولـو بعـد حيـن**)). هــەر کەسێکت بۆ سەفەر بەڕێ کرد پـێی بڵێ (**زودك اللـه التقـوى وغفـر لـك ذنبك وسير لـك الخير حيثما كنـت اسـتودع اللـه دينـك وأمـانتك وخواتيـم عملـك**) پێـم گەیشـتووە خۆشەویســـت ((**عليـــه الصــلاة**)) وا فـەرمانی بـە یـارانی خـۆی کـردوە ئامـادەی هـەر شـوێنێک بـوی بـێ فـــەرمانی خـــوای لـــێ دەکـــرا بەرهەڵستی ئەو بێ فەرمانیـەت پـێ نـەدەکرا لــەو شــوێنە دامەنیشـــە، پێغەمبـەر فەرموویـەتی ((**لا يمنعـن احدكم مخافـة النـاس ان يقـول الحق اذا شهد او علمه**))، سواک بەکاربێنـە چونکـە ڕەوشـتێکی پێغەمبەرانەیـە ((**السـواك مـن سـنن المرسـلين**))، خێرو چاکە بکـە چونکـە نـامری بـە ناهەمواری ئەوەش دەبێ لە ماڵێکی پاک بێ خودا شتی پاک نەبێ قبوڵی ناکا ((**ان احدكم ليتصرف بـالثمرة اذا كانت مـن طيب ولا يقبـل اللـه الا الطيب فيجعلهـا فـي كفـه فيربيهـا له كما يربي احدكم فلـوه او فصيلة حتى تكون في يده مثل الجبل**)).





# چاودێری بازاڕەکان



ئەمڕۆ لەبازاڕەکان نرخی ئازووقە گرانەو زۆرە، خـەڵکیش لەکاروباری بژێوی ژیانیـان سەرسـورماون، چونکـە تـەنگی بەژیانیان هەڵچنیوە، میریش دەیەوێت باروگوزەرانی گەلەکەی ئاسان بکات، بـۆ ئـەوەی بتوانـن بەئاسـانی بژێـوی ژیانیـان چـەنگ بکـەوێت.. تـا پلانـــی تـــەماعکاران چـاوچنۆکی بازرگانەکان لەسەر کڕین‌و فرۆشتن‌و پاشەکەوت‌و لەسـەریەك دانانی پارەو پولیان پووچەڵ بکاتەوە. هـەندێ لەخـەڵکانیش لەژێر سێبەری ئەم کۆمەڵە تەماعکارو بازرگانانـەدا خۆیـان حەشاردەوەو لەنێوان خۆیاندا دەیبەخشـنەوە.. هەندێکیشیان لەوانەی کەتووشی گێژەی ئەم نەبوونیە بووینە دەڵێن: خێرو خۆشی‌و ئاسودەیی‌و خۆشگوزەرانی تەنیا لـەئاینی ئیسـلامی پیرۆز ئاکارو باسی لێوەکراوەو دەست دەکەوێت، سنووریش بـۆ زگ برسـی دادەنێـت، ڕێگـا خۆشکەریشـە بـۆ بەرهـەم هێنەرەکان.. بەڵام هەندێکی تر دەڵێن: ئیسـلام چیـە؟، بـۆچ زانایـانی ئیسلام خۆیـان لـەم بـوارە نـەداوەو کاریـان تیـا نەکردووە؟!.. ئـەوەی ڕاستی بێت ئەمـە سـەرنجی ڕاکێشـام کەبتوانم ئا لێرەدا گەر بەشێك بەشێوەیەکی زۆر کورتیش بێت لەم نووسـراوەدا ئامـاژە بەچەند ئایـەتێك‌و فەرموودەیـەکی پێغەمبـەر (ﷺ) بدەیـن بـۆ خوێنـەرانی خۆشەویست لـەم دەسـتوورە پـیرۆزە کەموسـڵمانەکان هـەڵیان گرتـــووە بـۆ بازاڕەکانیان، کەبۆتە چارەسەر کردنی گرفتـەکانیان لەپارچـە پارچەیی‌و، ڕووتاندنەوەی دامـــالینی ناشـەرعیەت‌و بەدەسـت هێنانی پارەو پـوول‌و سـامان بـەڕێگای ناشـەرعیەوە بخەمـە بەردەستتان بۆ ئەوەی سوودمەند بێت.

جـا لەسـەرەتاوە دەمـەوێ بەمانـە ڕابگـەیێنم کـەدەڵێن موسڵمانەکان لەبواری هونەری ئابووری سیاسی‌و بازرگـانی کاریـان نـەکردووە.. لای هـەموتان ئاشـکرایە کـەوا مووسڵمانەکان هونەرێك نیە لەو جـۆرە هونەرانـە کـەجێیان هێشتبێ‌و لەدەرگایان نـەدابێ‌و دەرگایـان نەخستبێتە سـەر پشت، لێکۆڵینەوەی تەواویان لەسەر نەکردبێت.. هـەر بۆیـە جـەختی دەکەمـەوە کەئـەم نووسـراوە بـەکورتی دەخەینـە بەردەست،چونکە گەر لەسەری بنووسرێت ئەوا کۆتایی نایەت تەنیا دەبێـت بەشـێوەی کتێـب، بەدابـەش کردنـی ئـەبواب‌و بەشەکان، بەلێکۆڵینـەوەو بـەراورد کردن بێـت، بۆیـە ئێمـە ئالێرەدا ناتوانین بەم شێوە بەرفراوانیە بچینە ناو بابەتەکـە... بەهەرحاڵ پشت بە خـوا ئـەوەی سـوود مـەندبێت بـەکورتی باسیان لێوە دەکەین.

لەو کێشانەی کەلەئارادایە.. بەڵگە نەویستیشە کـەئاینی ئیسلامی پـیرۆز (دینـەو شـەرعی) واتـە یاسـایە، بـەمانای دەستورێکی ژیانـەن بـۆ ژیـان دارێـژراوە، بـەوەی کەهـەموو لایەنـەکان دەگرێتـەخۆو باسـی لەهـەموو وردو درشـتیەکی کـردووە، لەوانــە (کاروبـاری بازرگـانی- بازاڕەکـــان - پێداویستیەکانیان - نرخـەکانیان).. هـەروەها ئـەوەی لەبازاڕەکانیش ڕوودەدات بەکشـان‌و نیشتاویشـەوە، لەگـەڵ.. دان‌و توونـدیشدا، لـەم بارەیـەوە خـودای گـەورە لـەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:(یایهاالذین امنوا لاتأکلوا اموالکم بینکم بالباطل، الا ان تکون تجارة عـن تـراض منکـم).. هـەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) لەفەرموودەیەکا دەفەرموێت:(المتایعان بالخیار مالم یتفرقا، فأن صدقا وبینا بـورك لهمـا فی بیعهمـا. وان کذبا وکتما محقت برکه بیعهما). بـەڵێ ئـەم دەقانـە زۆرن کەهەموویان دەلالـەتن لەسـەر ئـەوەی کـەبازرگانی لەسـەر بنەچـەی ڕەزامـەندی تـەواوی هـەردوولاوە واتـە (کڕیـارو فرۆشیار) هاتووە، نابێت زۆر لێکردنـی تیـا بێـت، ناشـبێت وەبەهرە هانینی پێداویسـتی فرۆشـیار بکرێـت، یـان کڕیـار



نەرەگو ریشەوە ببردرێت، بەڵکو دەبێت بە -عەقدبێت.. ئەم - عەقدەش- بەرەزامەندی هەردوولاوە بێت، جیاوازی نێوان کەم و زۆری پارەشی تیا نەبێت، هەرکاتێ لایەنێکیش پێی ڕازی نەبوو (زۆر لێکردن) پەیدا دەبێت، جا کاتێ ئەم زۆر لێکردنە پەیدا بوو قورئانی پیرۆز قەدەغەی دەکاو فەرموودەکانی پێغەمبەریش ئاگاداری کردووینەتەوە بەمەی کەخودای گەورە پاداشی بازرگانی راستگۆ دەداتەوە.. بەئێنیشی داوە سزادانی هەموو فێلبازو حیلەو حەوالەچییەکان.. جا لێرەدا (خوتبەبێژ) لەمزگەوتەکان کەمێك دەتوانێت کار لەدڵی خەڵکاندا بکات کەپڕ بوونە لەخۆشەویستی دونیا بەجوانیو رازاوەیەکەی بەمەی کەشاد بوونە بەخێرو خواهیەکەی بێ گومان ئەمانەش لەڕێ نێبزرکراوەکان دادەنرێن، کەمێکیان لەوانە نەبێت، کەباوەڕی ڕاستەقینەیان هەیە، رۆژی قیامەتو زیندوو بوونەو کاریان تێ دەکات، گیانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ فرمانەکانی خودا، ئەم بارەیەوە خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ (وان کثیرا من الخلفاء لیبغی بعضهم علی بعض الا الذین امنوا واعملوا الصالحات وقلیل ماهم).

جا لەپێناو ئەوەدا دەبێت شەریعەتی خودا متمانە لەسەر خەتیبێکی تر بکات کەئەویش دەتسوورو یاسایە، تا لەدونیادا بیانترسێنن بەئوسوڵو ڕێسایەکی دارێژراو، دوزەکەشی سنووردانانە بۆ خەڵکانی بازار، تا بەهێزکار نەکاتە سەر بێ هێز، تا ناپاك زاڵ نەبێت بەسەر کەسانی پاکدا.. ئوسوڵی دەستووری بازاڕیش لەفەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) داهاتووە دەفەرموێت (انه نهی عن تلقی السلع قبل ان تجیء الی السوق).. بەوەی تا کڕیار لە خشت نەبردرێت کە نرخ نازانێت، یان کاتێ کڕیار لەکڕیار دەکڕێت بەبێ بەها، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) پەشیمان بوونەوەی جێگیر کردووە، زانایانی مووسڵمانیش هاوران لەسەر جێگیر بوونی پەشیمان بوونەوە گەر هاتوو تێشکان هەبوو. بەڵام گەر هاتوو تێشکان نەبوو رای زانایان جیاوازە.. بەمە ئیمامی شافیعی (ر) -شووبوهاتی- لابردیە بەرەزامەندی کڕیارو فرۆشیار بەدانانی پەشیمان بوونەوە گەر هاتوو لەقازانجەکە تێشکان نەبوو.. زۆری زانایانیش لەسەر ئەوەن کەپەشیمان بوونەوە پێویستە گەر هاتوو تێشکانەکە بێ مەرج بوو، چونکە ئەو کاتە دەبێتە سوخۆری هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (غبن المسترسل ربا).

بێ گومان ئەم کارە دەکەوێتە سەر ئەستۆی چاودێری بازاڕەکان لەداهاتوو رابردوودا، واتە نابێت هەروا بەجێ بهێشترێت بەبێ پەیڕەوی کردنی ڕێسایەکی دارێژراو، بەڵکو دەبێت لەسەر بنەمایەکی مەحکەم بێت بۆ ئەوەی هەندێ لەخەڵکان تیایدا تووشی زەرەرو زیان نەبن لەدەست هەندێکیان.. خۆی پەیڕەوی کردنی ڕێسایەکی دارێژراو بەتێکڕا مەبەست (شەریعەتی ئیسلامە)، جار هەرچەندە مەبەست گەورەتر بێت خەڵك بەتێکڕا خۆش گوزەرانتر دەبێت بەپێی تواناو ڕێگا گرتنە بەری ئەم شەریعەتە پیرۆزە.

بەمەوە ئامۆژگاری مووسڵمانەکان دەکەین کەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بەوشەی ترسێنەر گفت (وعید) دەمانترسێنێت، بۆ ئەو کەسانەیە کە کەم و کورتی لەکێشان و پێوانەکانیان دەکەن وەك (کوتانی کیلۆ-یان ناتەواوی تەرازوو کردن بەئەنقەست- یان گرانکردنی تایەکی تەرازوو لەتایەکەی تر - یان موگناتیس تێ خستن لەتای کێشانی شتەکە- یان رشاندنی شەکر بەئاو - یان خستنە سەرووی جوانەکان چی خراپیشە لەژێرەوەی حەشار دەدا). خوای گەورە دەفەرموێت :(ویل للمطففین، الذین أذا اکتالوا علی الناس یستوفون، واذا کالوهم او وزنوهم یخسرون).

هەروەها لەبەسەرهاتی شوعەیب پێغەمبەریشدا دەفەرموێت:(اوفوا الکیل ولاتکونوا من المخسرین، وزنوا بالقسطاس المستقیم، ولاتبخسوا الناس اشیاْهم) ولاتعثوا في الارض مفسدین).

ئەم شێوازانە بەخیانەتی گشتی لەقەڵەم دەدرێن، خوای گەورەش گوناهکاری خۆش ناوێت دەفەرموێت:(ان الله لایحب من کان خوانا اثیما).. لەفەرموودەیەکی تردا بەفرۆفێڵیان هیدایەت نادرێن (ان الله لایهدی کید الخائنین).

جا ئەوەی دێتە ناو چاودێری کردنی بازاڕەکان کەپێویستە چاودێری بکرێن ئەو شتانەن کەپەیوەندی دارن بەکڕین و فرۆتنەی گشتی لەفێڵ تێکردنیان، لەپیس کردنی نرخەکانیان. واتە تا فرۆشیار بەئارەزووی خۆیان نەبن بەرزو نزمیش بەنرخ نەکەن. بەمە چاودێر، چاودێری بازاڕەکان دەکات، کاری ناتاسایش قەدەغە دەکات، پەندیش بەسەر پێچی کەران دەدات بەپێی بارەکەی کەلەسەری گیراوە، بۆیە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت (لیس منا من غشنا) لەکاتێکاکەئەو فێڵە شتی کڕیار پیس بکات، یان شتی خراپی لێ حەشار بدات، ئەمەش بەتووندی حەرام کراوە، گەورەترین گوناهیشی پێ دەگا، نکۆڵی کردنیشی گەورەترە،



سزاشی بەتووندترە.. بۆیە لەسەر چاودێر پێویستە توونـد بێت لەسەر بازاڕەکان، نەیەڵێت جۆری فێڵ تێکردن بێتە ناو بازاڕەکان، گەر هاتە ناو بازاڕیش زوو دەستی بەسەرا بگیرێت، دەبێت بەو چەشنەش بێت کەهەموو شتو مەکەکان لەفێڵ تێکردن قەدەغە بکات.

لەبازاڕی گۆشتیشدا، دەبێت چاودێری گۆشتەکان بکرێت لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵەکان - مۆری چاودێریشی پێوە بێت- ئاژەڵەکە نەخۆش نەبێت بەم شێوەیە لەڕو لاوازیش نەبێت ببێتە هۆی تووش بوونی نەخۆشی- یان مردار نەبێت.. وە دەبێت چاودێری ئەم گۆشتەش بکرێت کەلای گۆشت فرۆشەکان دەفرۆشێت بۆ ئەوەی بزانن هی چ ئاژەڵێکە تا کارەساتی پێشوو دووبارە نەبنەوە وەك سەربڕینی (گوێ درێژو سەگو پشیلە)و هاتنی گۆشتەکانیان بۆ بازاڕ، بەڵگەش بۆ ئەمە وا لەبەرچاوە کە لەکاتی خۆی لەدەزگا ڕاگەیاندنەکانو ڕۆژنامەکان ڕاگەیندرا. بۆیە چاودێر دەبێت ئەم چەشنە کارانە هەمووی قەدەغە بکات کەفرۆفێڵی تێ کەوتووە. ناشبێت هەروا لێیان بگەڕێنو دووچاری سزا نەبن. جا هەر کەسێ سەرپێچی بکات یان نکۆڵی لێ بکات بە-تەزویر- کردن ئەو کاتە لەدوو ڕووەوە بەرپرسیار دەبێت، لەلایەن حوکومەت (میریەوە)، لەلایەن شەریعەتی ئیسلام.. بۆیە کێشان پێوان نادرێت بەهەموو جۆرە کەسانێك، بەڵکو دەبێ ئەو کەسانە جێگەی لێ ڕازی بوونو متمانە بن، هەقی ماندوو بوونیشیان لە-بەیتول مالەوە- پێ دەدرێت گەر هاتوو ولاتەکە پەرفراوان بوو.. جا لەم کاتەدا لایەنی بەرپرس هەڵدەستێ بەهەڵبژاردنو ڕێکخستنیان، ناوەکانیشیان لەدۆسیەیەکا تۆمار دەکرێت تا لەگەڵ ئەوانی تر تێکەڵاو نەبن.. ئەگەر هاتوو یەکێکیش لەمانە سەرپێچی کرد لەکێشان، یان بەلای زێدەی شکاندیەوە، دەبێت سزا بدرێت، واتە لەکارەکەی لابردرێتو مۆڵەتە یاسایەکەی لێ بسێنرێتەوەو جارێکی تر ئەم کارەی پێ نەسپێردرێت.

هەڵبەتا ئەوەی پەیوەندی دارە بەبازاڕ دوو لایەنەی هەیە، بۆیە لەسەر چاودێر پێویستە کەبڕیار بدات، لەسەر کەسانی پاك بەسپاردنی ئەم کارە بەوەی کەکەسانی خائین دوور بخرێنەوەو قەدەغە بکرێنو بەهیچ جۆرێك ئەم کارەیان پێ نەسپێردێت، چونکە بڕیار دان لەسەر کەسانی کەسەروەتو سامانی خەڵك بەغەدرو بەبێ ڕەوا بیخۆن. ئەمەش یەکەم شتە کەشەریعەتی خودا پێی ڕازی نیەو قەدەغەی کردووە.

بۆیە دەبێت چاودێری بازاڕەکان چاپووك بن لەچالاکیەکانیان، زیندوو بن لەکارکردنیان، بەهیچ جۆری چاوپۆشی لەتاوانبار نەکرێت، لەم نرخەیەی کەمیری بۆ ئەوانی داناوە پێی بفرۆشن، نابێت ماوەیان بدرێتێ بەکەیفی خۆیان زێدە بکەن چونکە زیان بەگشتی دەگەیێنێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا پێودانگەی بازاڕ ڕابگیرێتو بپارێزرێت، گشت توێژەکانیش دڵنیا بن.. لەمانە هەر یەکێ کارێکی نابەجێی بینی قەدەغەی بکات - سەرپێچی کەر سزا بدرێت، سزاکەش بەپێی تاوانەکەی بێت.. دەبێت لەسەر بچووك پاز نەداو لەگەورەش کەمتەرخەمی نەکات.. دەبێت لەنێوان ئەمو ئەودا دادوەر بێت، تا کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێر نەچێت لەهەموو کاتێکدا بەتایبەتی لەڕۆژانی تەنگو کەمی ئازووقەو بەرزبوونەوەی نرخەکانیاندا.. یان هەروەکو دەڵێن (گەر خستنە بەردەست کەم بێت، داواکردنی زۆر دەبێت) لەم کاتەدا دەست بەسەر بازاڕدا ناگیرێت، کەمتەرخەمیش لەم دەرفەتانەدا زۆر دەبێت، خەڵکانێکی زۆریش لەم دەرەفەتانەدا زۆر دەبێت، خەڵکانێکی زۆریش لەم پێداویستیە زەرووریانە بێ بەش دەبن، ئەو کاتە دەبێتە هۆی تەنگی ژیان لەلایەن داهاتوویاندا، بەپێی پێویست پێداویستی خۆیان مسۆگەر بکەن.

جا بۆیە سەرنج دەدەین، تەماشا دەکەین ئاینی ئیسلامی پیرۆز ڕێگا چارە سەرە بۆ ئەو گرفتانەی خستمانەڕوو، کەکۆمەڵگا ڕووبەڕووی دەبێتەوە بەچارەسەر کردنێکی ئاسانو سەرکەوتوو، بەوەی کەزوڵم لەکەس ناکرێت.

ئیمڕۆ حوکومەت واتە (میری) بەرپرسیارە، هەر دەزگایەك لەلایەنی خۆی بۆ نموونە: چاودێری گۆشتو مۆرکردنیان - تێك چوونی ئازووقە- سەردانی چێشتخانەی بازاڕەکان - ئوتێلەکان- کاری (وەزارەتی تەندروستیە).. ئاسایشی هاتووچۆی بازاڕەکان- نەهێشتنی تاوان - کاری (پۆلیسە).. فرمان دەرکردنو چاودێری دژ بەفرۆشیاری سەرپێی خۆراك لەپیس بوون، بۆ پاراستنی تەندروستی گشتی، دوورخستنەوەیان لەنەخۆشی -کاری پشکێنەری تەندروستیە).. چاودێری کردنی کێشانو پێوانەش - کاری (بەرژەوەندی کێشانو پێوانە) بەمەی کەناوە ناوە بەسەریان بکاتەوەو بانگەوازیان بکات بۆ لابردنی ئەم کەمو کورتیانەی کەتیایدا هەن، کێلۆیەکان لێیان وەربگیردرێنو لەکارکردن بکەون، فرمانیشیان بۆ دەربچێت کەدەبێت هی تازەیان بکەنەوەو هی نوێ بکرێنو لەشوێنیان دابنرێنەوە.





# لە ئاسۆی ئیسلامەوە

ئا: هێــرش

بینەرانی بەڕێز.. گوێ بیستانی نازیز..
خوشك و برایانی موسڵمان...

(لەئاسۆی ئیسلامەوە) بەرنامەیەکی ئایینی هەفتانەی ڕاگەیاندنی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستانەو هەموو ئێوارەیەکی ڕۆژانی شەممە لەکاتژمێر (٣٠ر٨) بەکاتی هاوینە لە کەناڵی (١)ی تەلەفزیۆنی هەرێمی کوردستانەوە: لەلایەن برای هاوکارتان (دلێر بابە شێخ نەقشەبەندی) ئامادەو پێشکەش دەکرێت و لە چاوی کامێرای برای وێنەگر (زوهدی مەولود)ەوە تۆمار دەکرێت و نیو کاتژمێر دەخایەنێت.

هەر وەك ئاشکرایە، نوسینگەی ڕاگەیاندنی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان، وەك تێکرای ڕاگەیاندنەکانی سەرجەم وەزارەتەکان و دام و دەزگا حکومی و حزبییەکان؛ ڕۆڵێکی بەرچاو و کاریگەری بینیوەو دەبینێت لە هۆشیار کردنەوەی جەماوەر لە چۆنیەتی بەخش کردن و خستنە رووی بەرنامەی کارو پرۆژەو چالاکیەکانی خۆی لەبوار جیاجیاکانی؛ (کۆڕی زانستی و سیمیناری ڕۆشنبیری ئیسلامی و کۆبوونەوەو پێشانگای هونەری وێنەی فۆتۆگراف و کتێب و مەختوتاتی ئایینی) ئەمە جگە لەبواری بنیات نان و ئاوەدانی نۆژەن و کردنەوەی تەکیەو مزگەوت و خانەقاو قوتابخانەکانی ئایینی و وەقف و نزرگەی شوێنە پیرۆزەکان) لەپێناوی خزمەت کردن بە هاوڵاتیانی موسڵمانی کوردستان و چاککردنی ژیان و گوزەرانی دژواری مامۆستایان و زانایانی ئایینی ئیسلامی پیرۆز؛ بەمەبەستی پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری زیاتر لەو بوارانەدا سەبارەت بە پێش خستنی ڕەوتی کاروانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە سۆنگەی خزمەتگەیاندن بەکۆمەڵ و بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی تۆکمەو پتەوی ئیسلامی لەهەرێمی کوردستاندا...

بۆیە ئێمەش بەپێویستمان زانی لە (دەلاقە)ی خۆری ئیسلامەوە سەرەتا بەبۆنەی داگیرساندنی دووەم مۆمی تەمەنی بەرنامەکەو بەمەبەستی زیاتر ئاشنابوون بە چۆنیەتی ئامادەکردن و پێشکەش کردنی ئەم بەرنامەیەو تۆمارگای مێژووی لەدایك بوونی بەرنامەی تەلەفزیۆنی (ئاسۆی ئیسلام) بێینە دەنگ و لە ڕێگای سازدانی ئەم دیمانەیەوە: هاوڕێیانی بەرنامەو بینەران و بیسەران و ڕۆشنبیرانی ئیسلامی پتر لێ ئاگادار بکەینەوە...

بۆ ئەم مەبەستەش بەڕێز (دلێر بابە شێخ) ئامادەکارو پێشکەشکاری ئەو بەرنامەیە لەوەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە تۆماری مێژووی پێشکەش کردنی بەرنامەی (لەئاسۆی ئیسلامەوە) گوتی:

* بەرنامەی (لەئاسۆی ئیسلامەوە) لەئەنجامی زنجیرە کۆبوونەوەیەکی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری وەزارەتەکەمان بەرەزامەندی بەڕێز جەنابی (وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی) و بەهاوکاری بەردەوامی بەڕێزان بریکاری وەزارەت و بەڕێوەبەری گشتی دیوان و تەرخان کردنی بودجەیەکی شیاو بۆی، هاتە ئاراو یەکەم زنجیرەی لە ئێوارەی ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی ٢٠/ حوزەیرانی/ ١٩٩٧ زایینی لە شاشەی تەلەفزیۆنی هەرێمەوە پێشکەش کرا. کە خۆم ئامادەو پێشکەشم دەکردو کاك (زوهدی مەولود)ی وێنەگریش لەڕێگەی چاوی کامێراکەیەوە بۆی تۆمار دەکردم کەسوپاس بۆ خوا، تا ئێستا بەردەوامەو زیاتر (٤٨) زنجیرەشمان لێ پێشکەش کردووەو تارادەیەك سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

پاشان بەڕێزیان لەوەڵامی پرسیارێکی دیکەدا سەبارەت بەشێوازی پێشکەش کردنی بەرنامەکەو پێکهاتەی گۆشە هەمە ڕەنگەکانی گوتی:



بەرنامەکەمان چەند گۆشەیەکی (جێگیرو گەڕۆکی) بەخۆیەوە گرتوە لەوانە (تیشکێك) کە گۆشەیەکی (جێگیر)ی بەرنامەکەیەو تیایدا باس لە (تەفسیری قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری موسڵمانان (محەمەد) (د.خ) دەکرێتو هەر لەو تیشکەوە؛ واتای ئایەتو فەرموودەکانی پێغەمبەری رابەرو پێشەوامان (حەزرەتی محەمەد (د.خ) تەفسیر دەکرێتو لێك دەدرێتەوە، شایانی باسیشە بەڕێز مامۆستا فاتیح المدرس هاوکاری لەم گۆشەیەدا کردوم سوپاسی دەکەم؛ دواتر (هەر جارەی بابەتێك) ئامادەدەکرێت؛ کە گۆشەیەکی دیکەی (جێگیر)ی بەرنامەکەمانە کە تیایدا بەدورو درێژی لە ژیانو مێژووی پێغەمبەرانو مامۆستایانو زانایانی ئایینی دەدوێ؛ بگرە زۆرجاریش لەو گۆشەیەوە؛ چاپکراوی نوێی ئایینی عەرز دەکرێت.

(پرسیارو وەڵام)یش گۆشەیەکی دیکەی (جێگیر)ە کەلەلایەن خەڵکێکی زۆری ئاین پەروەری هەرێمەوە؛ لەرێگای ناردنی نامەوە سەبارەت بەبنەمای ئیسلامو کێشە کۆمەڵایەتیەکانو موعجزە زانستییە ئایینیەکانو حیکمەتی قورئانو فەرزو سونەتەوە، پرسیارمان لێ دەکرێتو ئێمەش لەدەمی عولەمایەکی ئایینیەوە بەبەڵگەو حەقایقەوە وەڵامیان دەدەینەوە. دیارە دوو گۆشەی گەڕۆکیشمان هەنە کە ئەوانەش (هەواڵو چالاکیەکانی وەزارەت)و (میوانی بەرنامە)ن کە زۆرجار نیمانن...

ئەمەو بەرێزیان لەکۆتایی دیمانەکەدا گوتی:

* لەکۆتاییدا بەناوی خۆمانو سەرجەم هاوکارانمەوە، پیرۆزبایی گەرمان بەبۆنەی دووەم ساڵرۆژی تەمەنی بەردەوامو پڕ شکۆی بەرنامەکەمان، بەرنامەی (لەئاسۆی ئیسلامەوە) رادەگەیەنینو لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە؛ کە هەموو لایەك سەرفرازو سەرکەوتو بکات لەپێناوی بەردەوام بوونی تەمەنی ئەو بەرنامەیەو هەروەها پڕ بە دڵ سوپاسو رێزو ستایشمان بۆ بەرێزان جەنابی وەزیرو بریکارو سەرجەم ئەو بەرێزانەی کە هاوکاریمان دەکەن، بەتایبەتی بەرێوەبەرو کارمەندانی بەڕێزی رادیۆو تەلەفزیۆنی هەرێم دەنێرین کە کارمان سانا دەکەن لەپێناوی سەرکەوتنی بەرنامەکەمان. تەمەن درێژیو بەردەوامیان بۆ دەخوازینو سوپاس بۆ ئێوەو ئەم دیمانەیە.



# کوردو ئیسلام و... پیادەکردنی سیستەمی دیموکراتی

ئامادەکردنی: فەرهاد مەلا محەمەد

مێژووی رامیاری ئیسلامی خۆی لەخۆیدا، کەلەپوورو کەلتورێکی پڕ لە فەرۆ دەوڵەمەندە: ئەوەتا هەر لەپاش فەرمانداریەتی خەلیفەکانی راشدینەوە، سیستەمی رامیاری ئایینی لەهێلی ئیسلامەوە هاتۆتە خوارو بەرەو مەسەلەی دیاری کردنی شوراو فەتواو ئەنجومەنی زانستی ئایینیو هەڵبژاردنی خەلافەت لەسەردەمی خەلیفەکانی راشدینەوە؛ هەنگاوی نا، بێشك بزوتنەوەی رزگاری خوازی ئیسلامیش لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە تا بە ئەمرۆ دەگات، دروشمی فەرمان رەوایەتی ئیسلامیو گەڕاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامو رزگارکردنی وڵاتانی ژێر دەستەو داگیرکراوی ئیسلامی بەرزکردۆتەوە، بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە (ئایینی پیرۆزی ئیسلام) لەسەرەتای پەخش کردنی تیشکەکانی خۆری ئیسلامەوە، بڕوای بەسیستەمی رامیاری دیموکراسی ئایینی هاوچەرخ بووە، بۆیە لەرووی عەمەلیەوە؛ رۆڵی بەرچاوو کاریگەریەتی ئیسلام لەیاد ناکرێت، مرۆڤی موسڵمانیش کە رەگەزناوی ئیسلامی هەڵگرتووە هەر کارێك ئەنجام بدات؛ بەهەستی مەسئولیەت بەرانبەر بە(خوای گەورەو مەزن) بەئەنجامی دەگەیەنێت، بۆیە هەندێك جار (جێگیری) لە ژیانی ئادەمیزاددا هەیە کەلە دەلاقەی خۆری ئیسلامەوە مامەڵە لەگەڵ پەراوێزی گۆڕانکاریەکاندا دەکات، دیارو بەرچاوە لە پێوەدانگی ئەم ئایدۆلۆژیەتەوە، روناکبیرانی موسڵمان گەیشتونەتە تایبەتمەندیەکی ئەوتۆ کە (بوعدێك) لەکاروبارەکانیاندا بخولقێنن بێشك لێرەداو لە کلاو رۆژنەی مێژووی گەلی کوردستانەوە دەڵێین: هیچ نەتەوەیەك نیە



هێندەی گەلی کوردمان خەمی تاڵو سوێری چەشتبێ، رەنگە هیچ یەکێك نەهاتبێتە وجود هێندەی کورد، لەپێناوی وەدی هێنانی مافو ئازادیو سەربەستی رادەربڕینو داکۆکی کردن لە ئایینن کە بەش بەحاڵی خۆی راپەڕینو شۆڕشو بەگژداچوونەوەی؛ ئەنجام ئەدا بێت کە مەخابن زۆرجار تیایدا دوچاری لاوازیو شکستیو تێکشکان هاتووە دیارە هۆکاری ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جگە لەنەبوونی پاڵپشتێکی نێو نەتەوەیی بەرنامەی کارو نەخشەو پیلانی بۆداڕێژراوی نەبوو بۆیە نەیتوانیوە رووبەرووی بەرامبەرەکەی رابوەستێو داکۆکی لەمافەرەواکانی بکات. بۆ نموونە شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی (شیخ سەعیدی پیرانو شێخ عوبەیدوڵلای نەهریو شێخ مەحمودی حەفیدو قازی محەمەدی نەمرو ئیبراهیم خانی دەلۆ... سمایل ئاغای شوکاكو شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی شێخانی بارزان) شاهیدی حاڵی ئەو راستیەن لێرەدا هاوکات لەگەڵ ئەو دەرفەتەی لەبەر دەستمان دایە: شۆڕشەکەی (شێخ سەعید بەبەڵگەوە دەهێنینەوە کە یەکێکە لەو بزاڤە نەتەوییە کوردییانەی کە ئاکامێکی ئیجابی ئەوتۆی لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهاندا بەدەست هێنا: کە هاوکات لەو سەردەمەدا سوپای روسیای قەیسەری لەچاو تروکانێکدا هێرشی هێنایە سەر خاکی کوردستانو پەرتکردنی خاكو مێژووەکەی گەلەکەمانیان خستە نێو مەنجەنیقی جەنگێکی سەختو دژوارەوە، کە کوردیش ناچار بۆ داکۆکی کردن لەخۆیو سەروەری خاکەکەی وەڵامی ئەو جەنگە شومەی دایەوەو، خۆی دایە دەست جڵەوی دوژمنکارانەی وڵاتە خۆرئاواییەکان، بەڵێ جەنگی جیهانی بەکەم دوای ئەوەی چەند ساڵێك بەردەوام بوو: کۆتایی بە دەوڵەتی عوسمانی هاتو لاواز بوو، بۆیە بەهۆی بەستنی (هودنە)وە هاتەوە مەیدانو کۆتایی بەجەنگو شەڕو شۆڕەکانی هێنا، ئەوساتەش خاکی کوردستان کەوتە دەمی نەهەنگ ئاسای بەریتانیاوە.

شایانی باسە؛ دوای ئەوەی پەیمانی لۆزان کەلە ساڵی ١٩٢٣ مۆرکرا، تورکەکان؛ جڵەوی دەستەڵاتیان گرتە دەستو کاریان بە ئایندەو رابردووی هیچ یەکێك لە گەلانی گێتی نەما، خسوسەن (گەلی کورد)، سەرەتا (زمانی کوردیان) لەکوردەکان یاساغ کردوو (فەرماندەو سەرکردە)کانی کوردیان لەکوردستان دوور خستەوە تەنانەت بەکوردەکانیان بە (تورکە کێوییەکان) ناوزەد کردن، نموونەش بۆ ئەوە لەیاسای مادە (٨٨)ی تورکیادا دەڵێت (دانیشتوانی تورکیا بەهەموو ئایینو کەمە نەتەوایەتییەکانەوە، تورکن) ئەمانە هەر هەمووی کاریان کردە سەر گەلی کورد کە ئاوێزانی خۆ پڕ چەك کردن ببنەوەو بەگژ ئەو زۆرو زوڵمو ستەمەدا بچنەوە کە (تورکەکان) پیلانو نەخشەی ژەهراوییان بۆ دادەڕشت، ئەوەتا هەڵایسانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانو شەڕەکانی ئاگری داخو دەرسیمو شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری نموونەیەکی بەرچاوی ئەم زوڵمو ستەمەیە، کە تورکەکان دەرهەق بەگەلەکەمان ئەنجامیان داوە، بۆیە کاردانەوەی کورد، دژ بە کەمال ئەتاتورك کە خەلافەتی ئیسلامیان لە تورکیا یاساغو قەدەغە کرد بوو، دژ بە ئیسلام شاڵاوی درندانەیان دێنایە سەر کوردەکانو خاکەکەیان، بۆیە شێخ سەعید بۆی دەرکەوت (کەمالیستەکان) مخالەفەی ئیسلامنو دژ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەجەنگن؛ داوای لە (مستەفا کەمال) کرد کە هەوڵ بدات خەلافەتی ئیسلام بگێرێتەوە دۆخی جارانو کوردەکانیشی پڕ چەك کردنو داوای لێ کردن کە تا زووە شۆڕش بەرپا بکەن تا بناغەی ئیسلام دەچەسپێنن، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر رێکخراوە پیشەییو جەماوەریو سیاسیو ئیسلامیەکان پشتیوانی لەو شۆڕشە کردو ئامادەییان بۆ خۆ پڕ چەك کردنیان دەربڕیو رەگەڵ شۆڕشی (شێخ سەعید) کەوتن لەپێناوی سەربەخۆی کوردستانو چەسپاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەسەرتاسەری کوردستاندا.

---

**سەرچاوەکان:**


- پەیامی راستی ژمارە (٥٠) ١٩٩٧- هەولێر.
- چەندین بەرهەمی دیکەی ئایینی.
- رۆژنامەی (راپەڕین)ی ئایینی.
- کتێبی مێژووی قۆناغەکانی (٣،٢،١)ی ناوەندی.

مێژووی کوردو کوردستان/ عبدالرحمن قاسملو



# موعجیزە زانستیەکانی قورئان و سوننەت

مەلا رەشید گەردی
ئیمام و خەتیبی مزگەوتی شەهید سەباح

ئاشکرایە کەکاری سەرەکی قورئان بریتی نی یە لەوەی کەعەقلبازیو تەنگوچەڵەمەی کۆن شی بکاتەوەو لەچۆنیەتی دروست بوونی بوونەوەر بەشێوەیەکی علمیو زانستی بکۆڵێتەوە. بەڵکو قورئان بریتی یە لەپەڕاوو کتێبێکی ڕێ پیشاندەرو شارەزاکەری کۆمەڵی ئادەمیزاد لەژیانی ئایینیو دونیەویو بەختەوەر بوونیان لەهەردوو دونیادا بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئایەتەکانی خاڵی نین لەبۆچوونی لایەنی علمیو زانستیو دەربڕینی شتی وردەکاریو وەستایانە لەتیلنیشان کردنی نهێنیەکانی زۆر لایەنی سروشتیو نوشداریو زەوی ناسیو جوگرافی.. بەجۆرێك کەهەریەکەیان دەلیلو بەڵگەیە لەسەر ئاسایی و قورئانو داکۆکی کردنە لەسەر ئەوە کەقورئان نیگاو سروشتی خوای گەورەیە. شتێکی مێژوویی چەسپاوە کەحەزرەتی (محمد) (ﷺ). جگە لەوەی کەخوێندەواری نەبووەو نووسینو خوێندنەوەشی نەزانیوە. لەمەککەو لادێیەکانی مەککەش پەروەردە بووە. ئەو رۆژگارەش مەککەو دەوروبەری هیچ زانستو زانیاریەکی تێدا نەبووە. قوتابخانەو خوێندنگاو دانیشگای تایبەت بەزانیاری بوونەوەری تێدا نەبووە. هەروەکو چۆن (محمد) (ﷺ) دوور بووە لەو زانستو زانیاریەی کەلەشامو ئەسکەندەریەو ئەسیناو رۆما دەخوێندراو توێژینەوەی تێدا دەکرا. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بۆچوونو نەزەریە علمیانەی قورئان ئاماژەی بۆ کردون لەو رۆژگارەدا کەس پەی پێ نەبردونو نەزاندراو بوون. واتە. لەسەدەی حەوتەمیی زایینیدا. علمو زانستیش هەتا ئەم نزیکانە نەیتوانی سیرو نهێنی ئەم نەزەریانەی قورئان دەربخاو بۆچوونەکانی روون بکاتەوە. جا من لەم بەشەدا برێ لەو زانستیە راستەقینانەی قورئانو چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) رادەنوێنم تا موسڵمان بۆ خۆی لێیان ورد بێتەوەو هۆشو بیری خۆی بکا بەدادوەرو بڕیار بدا ئایا دەگونجێ ئەم زانستیانە هەڵبەستراوی پێغەمبەر ر بن یان نیگاو سروشتی خوایە نێردراوە بۆ پێغەمبەری مەزن (ﷺ). بەڵێ قورئان گەورەترین بەرنامەی بەشەریەتە. بەرزترین بەڵگەیە بۆ پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ). وەبەهێزترین معجزەی پێغەمبەری مەزنە(ﷺ). شیفای هەموو ناخۆشیەکانی ئادەمیزادە. سارێژی برینەکانی کۆمەڵانە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێ (وننزلُ منَ القُرآنِ ما هُوَ شفاءٌ وَرَحْمَةٌ للْمُؤمنينْ) دەفەرمووێ (ئێمە لەو قورئانەی ناردیمانە خوارەوە بۆ ئادەمیزاد کەشیفای دەردو ئازارو ناخۆشیەکانی ئادەمیزاد بکات) بەڵێ رەحمەتی میهرەبانی خوایە ئەو قورئانە لەبۆ ئادەمیزاد. هەموو ئادەمیزادو جنۆکە بەهەموو هێزو تواناو علمو زانستیانەوە. گەر بیانەوێ وێنەیەك وەکو ئەم قورئانە بهێننە کایەوە ناتوانن و بۆیان ناکرێ. ئەگەر هەموو هێزیان تێدا بەکار بهێنن هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ(قُلْ لئنِ اجتمَعَتِ الانسُ والجنُّ على أن يأتُوا بمثْلِ هذا القُرآنِ لا يأتونَ بمثْله ولَو كانَ بعضهُم لبعْضٍ ظهيراً). کەواتە ئەو قورئانە معجزەی خوایە بۆیی کەس ناتوانێ بەرنامەیەکی ئاوا کاملو شامل بۆ ئادەمیزاد بهێنێتە کایەوە. وەموعجیزەکەشی لەوەدایە کە(١٤١٨) ساڵە ئەو قورئانە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئێستاش وەکو خۆی مایەتەوە. بۆیێ دەبێ ئادەمیزاد بەدڵێکی فراوانەوە وەری بگرێو بیکاتە شیفای برینەکانی چونکە ئەو قورئانە رووەکاتە موشریكو کافرەکانو بێ باوەڕەکان تەعەدایان دەکات تا رۆژی قیامەت. کەوا ئەگەر بتوانن قورئانێکی ئاوا دابنێن کەکامڵ ژیانی تێدابێ. هەروەك قورئان دەفەرمووێ (إنْ كُنْتُم في رَيْبٍ مِمّا نَزَّلنا على عَبْدنا فأتوا بسُورةٍ من مثْله ادعُوا شُهدائكُمْ منْ دُونِ الله إن كُنتُم صادقينْ) خوا دەفەرمووێ بەکافرو موشریکەکان کەدەڵێن ئەو قورئانە هی خوا نی یە. ئەگەر راست دەکەنو شكو گومانتان هەیە لەراستگۆیی (محمد) (ﷺ) دەفەرمووێ



...وا بسورةٍ منْ مثْله) (دەیەك سورەتی ئاوا بێنن).

لەسە رەتێکد ...فەرموێ دە قورئانیکی ئاوا بێنن. لەئایەتێکی دیکەد. دەفەرمووێ (فأتوا بعشر سور مفترياتْ) دەفەرمووێ (١٠) سورەتی ئاوا بێنن) یەعنی خوای گەورە کەمترین تەحەدا دەفەرمووێ یەك سوردت وەکو ئەم قورئانە بینن.. ئەگەر ئێوە راست دەکەن کەدەڵێن ئەو قورئانە هی خوا نی‌یەو قسەی بەشەرە. ئەگەر قسەی بەشەر بێ دە ئەوی بێ بڕوایەکان ئێوەش یەك سورەت وەکو ئەم قورئانە بێنن، بەلام ناتوانن خوای گەورە دەفەرمووێ (فانْ لمْ تفعْلوا ولنْ تفعلوا) ئەمما ئەگەر نەتان توانی وەکو ئەم قورئانە بێنن وە ناشتوانن (ولنْ تفْعَلوا) خوای گەورە (لن) بەکاردێنی کە(لن) لەبۆ تأکیدە) یەعنی هەتا هەتایێ ئەن بێ باوەڕەکان ناتوانن وەکو ئەم قورئانە بێنن. بزانە ئەوەش موعجیزەیەکی دیکەی قورئانە. دەنا ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە نەهاتبایە خوارێ. چۆن پێغەمبەری مەزن ئاوا جەزم بکات بە(لن) بلێ‌و بفەرمووێ (ولَنْ تفعَلوا) وە ناتوانن هەتا هەتایێ قورئانێکی ئاوا بهێننە کایەوە.

چونکە ئەگەر ئەم قورئانە گۆتەی ئادەمیزاد بێ. مومکینە لەناو مێشکی خۆی بلێ ئەگەر ئێستاش نەتوانن خۆ لەوانەیە پاش (٥٠) سالی دیکە یان پاش (١٠٠) سالی دیکە بتوانن. بەلام ئادەمیزاد ئەو جەزمەی ناکات وە بەبێ شك ئەم قورئانە هی خوای گەورەیە. هی دروستکەری ئەو بوونەوەرەیە. بۆیێ جەزم دەکاتو دەفەرمووێ.. (ولَنْ تفْعلوا) ناتوانن هەرگیزاو هەرگیز وێنەیەك وەك ئەم قورئانە بهێننە کایەوە. ئەگەر نەتانتوانی وە ناشتوانن قورئانێکی ئاوا بێنن دەفەرمووێ (فَاتقوا النَّار التي وَقودُها الناس والحجارة أعدتْ للكافرينْ). دەفەرمووێ (ئەگەر نەتانتوانی قورئانێکی ئاوا بێنن دە خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن ئەو ئاگرەی کەسوتەمەنیەکەی خەڵكو بەردن وەرن بڕوا بێنن بەو قورئانەی خوای پەروەردگار).

بەلێ ئەوەی کەئێستا علم وا اکتشاف دەکاتو بەدیاری دەیەخات لەسەر زەوی‌و ئاسمان ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ١٤١٨ سالە باسی لێوە دەکات. بەجۆرێك کەئەوە دەسەلمێنێ دەیکاتە دەلیلو بەلگە لەسەر خودی قورئانی پیرۆز. کەبەلێ ئەی بەرەی ئادەمیزاد ئەی پرۆفیسۆرو دکتۆرو فەلەك زانەکان کەئەم قورئانە وەحی‌و نیگای خوای پەروەردگارە. ئایا دەگونجێ ئەو هەموو علمو زانستانەی قورئانی پیرۆز هەلبەستراوی بێ یان نیگای خوای نێردراوە بۆ محمد (ﷺ).

١) ئەوەتە خوای گەورە دەربارەی یەکپارچەیی بوونەوەرو نهێنی ژیان لەقورئاندا دەفەرمووێ (أو لم یر الدین كفروا أنَّ السموات والأرضَ كانتا رتقاً ففتقْناهما وجَعَلْنا منْ الماء كُلَّ شيء حيّ أفلا يؤمنوُن) الانبياء. دەفەرمووێ (ئایا ئەو کافرانە ئەو بێ باوەڕانە بیریان نەکردۆتەوەو نازانن کەلەسەرەتادا ئاسمانەکانو زەوی یەکپارچە بوونو ئێمە لێکمان جیاکردونەوە. وە بەهۆی ئەو ئاوەشەوە کەلەئاسمانەوە دەیبارێنین هەموو شتێکی زیندومان دروست کردوە. واتە ئاو هۆی ژیانە لەسەر زەوی دەی بۆچی بڕوا ناهێننو موسلمان نابن).

ئەم ئایەتە پیرۆزە خەبەرمان دەداتێ کەئاسمانەکانو زەوی یەکپارچە بوون دوایی لێك جیابوونەوە. بەڕاستی ئەمە موعجیزەیە کەلەموعجیزە عیلمی‌یەکانی قورئانو زانستی تازە ئەم رایە دەچەسپێنێ‌و زانایان گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە بۆشایی بوونەوەر پێش هەزاران ملیۆن سال لەمەوبەر پڕ بووە لەغاز ئەو غازەش لێك پچڕاوەو بووەتە تەم‌و غازو ئەم ئەستێرە کاکەشانەی لێ پەیدا بووە مەنزومەی رۆژ ئەنجامی ئەو لێك جیابوونەوەیە. ئەوەی پالپشتی ئەم بۆچوونو رایە دەکا ئەوەیە کەتا ئێستا زاناکان بەبەلگەو دەلیل چەسپاندویانە کەلەناو توخمەکانی رۆژدا (٦٧) توخمیان لەتوخمەکانی زەوین. زەویش بۆ خۆی لە(٩٢) توخم پێك هاتووە. بەردەوامیش زاناکان هەولی ئەوەیانە عونصوری تریش لەرۆژدا بدۆزنەوەو گیروگرفەکانی ئەم رێبازە لابەرن تائێستا ئەو عونصورانەی کەلەرۆژدا دۆزراونەوە لەناو خۆماندا زۆر مەشهورن بریتین لە(هایدرۆجین‌و هەلیوم‌و کاربۆن‌و ئازووت‌و ئۆکسجین‌و فسفۆرو ئاسن‌و...هتد) زاناکان بۆ ئەم مەبەستە لێکۆلینەوەی شەبەنگی طەیفی یان بەکارهێناوە ئەم شێوە توێژینەوەش کیمیازانەکانی ئەمڕۆ لەکارگەو تاقی کردنەوەکانیاندا بەکاری دەهێنن بۆ دۆزینەوەی ئەصلو بنەماو هەیولای هەر پارچەیەکی زەوی‌و زانینی نەوع‌و رێژەو چەندیەتی زاناکان گەیشتونەتە ئەو قەناعەتە کەئەو توخمانەی خۆری لێ پێك دێت هاتوە خۆریش بۆ خۆی ئەستێرەکەو نمونەی ئەستێرەکانی ترە. بوونەوەریش بریتیە لەو ئەستێرانە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ



کەئەو ئەصلّو بنەماو عونصورانەی بوونەوەری لێ پێك هاتووە. لەبنەڕەتدا یەك عونصور بووەو لێك جیابوونەوە لەلایەکی ترەوە (نەیازیك) بلیسەو شوعلە یەکێکە لەو شتە هەست پێ کراوانەی کەزانیاری‌و زانست لەفەزای خاریجیدا قۆزتوویەتیەوەو بەدەستی هێناوە زاناکان هەستیان بەوە کردووە کەزۆربەی ئەو عونصورانەی لەزەویدا هەن هەمان عونصریش لەنەیازیکە بەردیەکاندا هەیە ئەمە پوختەیەکی بەشی یەکەمی ئایەتەکەیە. بەشی دووەمی ئایەتەکە کەدەفەرمووێ (وجَعَلنا مِن الماءِ كلَّ شيءٍ حَيّ) بەڕەوانترو بەلیغ ترین شتێك دەزانـدرێ کەقورئان لەبارەی حەقیقـەتێکی زانستی‌یەوە باسی کردبێ، زانایان نهێنی‌یەکەیان زانیبێ، چونکە زۆربەی تێکەولێکەی کیمیاوی پێویست بۆ ژیان‌و گەشە کردن پێویستی بەئاو هەیەو ئاو عونصورێکی سەرەکی‌یە بۆ بەردەوام بوونی ژیانی هەموو زیندەوەرو رووەکێك. ئاو بۆ خۆشی سێ بەش لەچوار بەشی زەوی دادەپۆشێ پلەی توانەوەشی بەرزە ماوەیەکی زۆریش بەشلی دەمێنێتەوە پلەی گەرمیشی زۆر بەرز دەبێتەوە. لەبەر ئەم هۆیانە ئاو بەیارمەتی دەرێکی باش دەژمێردرێ بۆ راوەستانی پلەی گەرمی لەسەر رووی زەوی لەموعەددەلێکی تایبەتی‌دا. لەلایەکی ترەوە سەر رووی زەوی دەپارێزێ لەسوران‌و گۆرانی سامناکی سروشت‌و بەرزبوونەوەی گەرماو نزم بوونەوەی سەرما یان بەپێچەوانەوە خۆ ئەگەر بەهۆی ئاوەوە نەبێ سەر زەوی بۆ ژیان ناگونجێ هیچ نەبێ ژیانی تێدا زەحمەت دەبوو. هەروەها ئاو چەند دیاردەیەکی تریشی هەیە لێرە جێگایان نابێتەوە هەمووشیان ئەوە دەگەیەنن کەبەدی هێنەری بوونەوەر زۆر کارامەیەو بوونەوەری وا تەرتیب داوە کەبگونجێ بۆ ژیان‌و بەرژەوەندی دروستکراوەکان، شایانی باسە کەگوتری ئاو تەنها مادەیەکە لەکاتی بەستن‌و بوون بەسەهۆڵدا قەبارەی زیاد دەکاو چڕیی کەم دەبێ ئەمەش گرینگی‌یەکی گەورەی هەیە بۆ ژیانی زیندەوەرانی ناو ئاو چونکە لەکاتی سەرمای زۆردا سەهۆڵ بەندانەکە دەبێتە پەردەیەکی جیاکەرەوە ناهێڵێ ئەو ئاوەی لەژێر سەهۆڵ بەندانەکەدایە سەرمای سەر رووی زەوی کاری تێ بکات بەڵکو ئاوەکە لەپلەیەکی ژوور پلەی بەستندا دەهێڵێتەوە، کاتێك پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە ئۆکسجین زۆر هەڵدەمژێ کەپلەی ساردیش دەگاتە پلەی بەستن ئەندازەیەکی زۆری گەرمی لێ دەردەچێ‌و دەبێتەوە یارمەتی دەر بۆ پاراستنی زیندەوەرانی ناو دەریاو چۆمەکان وەکو ماسی‌و تیمساح‌و مارو شتی تریش دەی تەماشای حیکمەتی قورئان بکەن چۆن بەچەند وشەیەکی کەم نهێنی ژیانی لەسەر زەوی روون کردۆتەوە. ئەم ئایەتەش بەهێزترین بەڵگەیە لەراستییەتی پێغەمبەرایەتی محەمەد(ﷺ) لێرەدا قورئان سەرەتای ئەم زانستی‌یە راستەقینانەی دەربارەی یەکپارچەیی بوونەوەرو نهێنی ژیان بەوەدەست پێ کردوە کەروو دەکاتە خوانەناسان‌و بەبەڵگەی زانستی‌ی بەهێز دەم کوتیان دەکات. ئەو زانستی‌یە راستەقینانەی کەعەرەبەکان لەرابوردوودا هیچیان لێ نەزانیوە بەڵکو تا ئەم نزیکانە دوای (١٤٠٠) ساڵە پاش ماندووبوون‌و لێکۆڵینەوەی چەندەها چین لەزانایان‌و توێژەرەوەان‌و پێشکەوتنی عیلمی‌و زانست ئەمجا شتێکی کەمی لێ زاندراوە تا عیلمیش پێش بکەوێ زیاتر نهێنی قورئان‌و بۆچوونەکانی دەربارەی عیلم‌و زانست ئاشکرا دەبێ. ئەم راستیانە گەورەترین بەڵگەو هەڵنەرن لەسەر باوەڕ بەبوونی خواو دەسەڵاتی فراوانی‌و نهێنی دروست کراوەکانی. هەر بۆیەشە خوای پەروەردگار لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرمووێ (أفلا يؤمنونْ) واتە: ئایا ئەم بەڵگانە بەس نین بۆ بڕوا کردن بەبوونی خوای گەورە. دەی بۆچی باوەڕ ناهێنن‌و موسڵمان نابن؟........).

٢) دووەم موعجیزە زانستیەکانی قورئان کەباسی لێوە دەکات. دروست بوونی بوونەوەرە. خوای گەورە دەفەرمووێ:(قُلْ أئنكمْ لَتَكفُرونَ بالذي خَلقَ الأرْضَ في يوْمينِ وَتَجْعلونَ له أنداداً ذلكَ رَبُّ العالمين. وجَعلَ فيها رواسيَ مِنْ فَوقِها وَبارَكَ فيها وَقَدَّرَفيها أقواتَها في أربعةِ أيامٍ سواءً للسائلينْ. ثمَّ استوى إلى السَّماءِ وهي دخانٌ فقالَ لها وللارضِ ائتيا طوعاً أو كرهاً قالتا أتينا طائعينْ). واتە: ئەی محمد(د.خ) بەقورەیشی‌یەکان بڵێ ئایا ئێوە بڕوا ناکەن‌و ئیمان ناهێنن بەو خوایەی ئەرزی لەماوەی دوو رۆژدا دروست کردووە هاوڕێ‌و شەریکی بۆ دادەنێن؟ چۆن وا دەکەن. ئەوەی کەئێوە بڕوای پێ ناکەن پەروەردگاری بوونەوەرو زەوی دروست کردوە کێوەکانی لەسەر کردوون بەلەنگەرو مێخ تا زۆر نەجولێتەوە ئەمجار کردیتی بەکانگای خێرو بەرەکەت رزق‌و رۆژیی زیندەوارنی تێدا ئەنجام داوە.

هەموو ئەم کاروبارانەی لەماوەی چوار رۆژدا رێك خستوە ئەمجار لای لەدروستکردنی ئاسمان کردەوەو ویستی دروستی بکات ئەو کاتە ئاسمان بریتی بوو لە(دخان) دووکەڵ ئیتر



بەو شێوەی ویستی خۆی بوو نەخشەی کێشا بوو فرمانی بەئەرزو ئاسمان کردو فەرمووی وەرنە کایەوە ئەوانیش هاتنە پێشەوەو وتیان پەروەردگار هاتین). لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەئاشکرا ئەوە دەدرکێنێ کەئاسمان لەسەرەتای دروست کردنی کەونڈا بریتی بووە لە (دووکەڵ). زانایانیش فەلەك زانان. لەم بارەوە چەند راوو بۆچوونێکی جیاجیایان دەربارەی دروست بوونی ئەم بوونەوەرە هەیە، یەك لەو زانایانە. کەزانای ئاسمان شوناسە (سیرجیمس جینز) دەڵێ رای پەسند ئەوەیە کەمادەی کەون لەسەرەتادا غازێکی بڵاو بووەوە بەنێو بۆشایی فەزادا دوایی لەزیادە پەستیو کەسافەتی ئەم غازە تەم (سەدیم) گەلەکان دروست بوون. دکتۆر جامۆ (Dr. George Gamaw) دەڵێ: کەون لەسەرەتای دروست بوونیدا پڕ بووە لەغازێکی دابەشکراوی رێكو پێك ئەو غازە لەکەسافەتو گەرمیدا گەیشتۆتە پلەیەکی هەرەبەرزی گەرما. جا لەم غازەدا چەند گۆڕانکاریەکی نەوەوی لەزۆربەی توخمەکانیدا پەیدا بووە ئیتر لەژێر کاریگەری زیادە پەستانێکی بەهێز بۆ ئەو غازە گەرمە کەون لێك کشاو درێژو پان بوو. ئەمجار کەسافەتی غازەکە وردە وردە فش بووەوە پلەی گەرمی دابەزیو سستی تێ کەوتو لەسەردەمێکی دیاری کراوی ئەم لێك کشانەوەدا غازە بڵاوە کە کۆپلە کۆپلە بوو چووە شێوەی هەوری نارێكو پێكو لێك نەچوو لەشکڵو قەبارەدا ئەمجار گۆڕانو بوونە چەند ئەستێرەیەکی جیاجیا. قورئانیش بۆیە بنچینەی کەونو بوونەوەری بەدووکەڵ ناو بردوە، چونکە عەرەبەکان دووکەڵیان ناسیوەو هەموو کات لەپێش چاو بووە. ئەمڕۆ زانایان بناغەو سەرەتای کەون بەغازو دووکەڵ دەزانن و پێیان وایە کەونو بوونەوەر لەو غازە بڵاوە بەدی هاتووە، دەی باشە کەی لەتوانای نەخوێندەوارێکی وەکو پێغەمبەر(د.خ) دایە پێش (١٤٠٠) ساڵ ئەمە بزانێ بەتایبەت لەم رۆژگارەدا ئادەمیزاد هیچیان ئاگایان لەنهێنی کەونو شێردراوەکانی نەبووە...).

٣) موعجیزە زانستیەکانی قورئان. لێك کشانەوەو فراوان بوونی کەونە خوای گەورە دەفەرمووێ (وَالسماو بنيناها بأيد وإنا لُمو سعُون). واتە ئێمە ئاسمانمان بەدەستی قودرەت دروست کردوە هەموو کاتێکیش فراوانی دەکەینو لێکی دەکشێنینەوە) ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە بەئاشکرا باسی لێك کشانەوەی کەون دەکاو لەگەڵ تیۆری فراوان بوونی کەون یەکیان گرتۆتەوە.

لەبارێکەوە دەبینین ئەنیشتاین پێی وایە فراوانی کەون بەجۆرێکە کەبۆ حەوانەوەی مەلایین(سەدیم) بگونجێ هەموو سەدیمێکیش سەدەها ملیۆن ئەستێرەی گڕدار لەخۆ بگرێ، لەبارەی تیۆری فراوان بوونو لێك کشانەوەی کەونیشەوە ئاسمان شوناسەکان زۆر لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان ئەنجام داوە بەهۆی پێشکەوتووترین ئامێری تەماشاکردن (دووربین)ەوە ئەوەیان لەلا ئاشکرا بووە کەجوڵانەوەی سەدیمەکانی دەرەوە جوڵانەوەیەکی بەترتیبو مونتەزەمە لەمەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە رایان بۆ ئەوەچووە کەهەموو سەدیمەکانی دەرەوە یان دورگەکانی کەون (الجزر الكونية) رۆژ بەرۆژ لەکۆمەڵی رۆژ دوور دەکەونەوە بەڵکو هەموو سەدیمەکانی لەناو خۆیاندا لێك دوور دەکەونەوە. ئەمجار ئەوەیان چەسپاندوە کەکەون راوەستاو نیەو لەسەر یەك حەجم نامێنێتەوە، بەڵکو وەکو چۆن کەفی صابوون فشو فۆڵ دەبێ یان چۆن باڵۆن فش دەبێتەوە کەونیش بەو جۆرە لێك دەکشێتەوە، بەڵام جیسمە مادییەکانی لەسەر قەبارەی خۆیان دەمێننەوە. شایانی باسە کۆمەڵێك زانای کەون ناس چەند رەئیەکیان خستۆتە روو هەریەکەیان بۆ خۆی راڤەی نهێنی فراوان بوونی کەون دەکا. یەکێك لەوانە دکتۆر هابل Habble رابەری توێژەرەوەکانی سەدیم تێبینی ئەوەی کردوە کەدیاردەیەکی گشتی لەنێو ئەم کۆمەڵە ئەستێرە زۆرو زەبەندانەدا بەدی دەکرێ دیاردەکەش ئەوەیە ئەم ئەستێرانە بۆ پشت لێك کردنو لێك دوورکەوتنەوە گونجاوترن تا لێك دوورکەوتنەوەی دوورگە کەونیەکان پەیدا دەبێ...).

٤) موعجیزە زانستیەکانی قورئان. هاتووچۆ هەڵسوڕانی مانگو رۆژو زەوی: خوای گەورە دەفەرموێ (والشَمسُ تَجري لِمستقّرلها ذلك تَقْدير العَزيز العليمْ. والقمرَ قَدَّرنـاهُ منـازل حَتّى عاد كالعُرْجُونِ القَديم. لا الشَّمْسُ يَنْبغي لها أنْ تُدرِكَ القَمَرَ وَلاَ اللَيلُ سابِقُ النّهَار وكُلُّ في فَلك يسـبحُونْ). واتە (نیشانەیەکی تر لەسەر گەورەییو بەدەسەلاتی خوا ئەوەیە. کەخۆر دەڕواو دەگەڕێ تا ئەو شوێنەی بۆی دیاری کراوە ئەم بۆ دیاری کردنو ئەندازە دانانەش لەلایەن خوای بەتواناو زاناوەیە. هەروەها بۆ مانگیش چەند مەنزڵو حەشارگەیەکمان بۆ داناوە کەبریتیە لە(٢٨) پلەو مەنزڵ هەر شەوە مانگ لەیەکێکیان دایەو مەنزڵێکدا تێدەپەڕێ کەگەیشتە کۆتایی دەگەڕێتەوە بۆ سەر شێوەی کۆنیو بەبارێکی دێتە پێش چاوو کەوانەیی خۆی دەنوێنێ وەك



لاسکی بۆلە خورمای کۆنی چەماوە کە هێشودکەی لێ کرا بێتەوە ئاوا. نەخۆر رایەی دەکەوی بچێتە رێبازی مانگەوە یا مانگ بەرێبازی خۆردا بروا هیچ کاتێکیش شەو پێش رۆژ ناکەوێ واتە. هەریەکەیان لەکاتی دیاری کراوی خۆی پەیدا دەبێ. هەریەکەش لەرۆژو مانگو زەوی و ئەستێرەکان لەبۆشایی کەون داو بەرێبازی خۆیاندا دێن و دەچن، کاری پێ سپێراوی خۆیان ئەنجام دەدەن).

بەکورتی قورئان لەم ئایەتە پیرۆزەدا راستەوخۆ ئەوە دەچەسپێنێ کەرۆیشتن و گەرانی رۆژ تا ئەندازەیەکی دیاری کراوە م زانستیەش لەگەڵ زانستی تازەدا یەك دەگرنەوە. رۆژ لەگەڵ کۆمەڵەی خۆیدا لەهەر چرکەیەکدا (١٩) کم بەرەو شوێنێکی دیاری کراو دەبرێ. وە ئەگەر سەرەنجی ئایەتی (وَكُلٌ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونْ) بدەین و راستەوخۆ ئەوە دەگەیەنێ کەرۆژو مانگو زەوی لەجمو جۆل دان بەلام ئەم جمو جۆلە یان لەجمو جۆڵەکەی پێشوو جیایە بەڵکو سوران و هاتوچۆکەیان تایبەتییەو هەریەکەیان بەدەوری خۆیدا دەسورێتەوە. دەربارەی سورانەوەی زەوی قورئان بەرستەی (وَلا اللَّيلُ سابِقُ النَّهار) ئیشارەی بۆ کردوە چونکە لەسورانەوەی زەوییەوە شەوو رۆژ پەیدا دەبێ..).

نموونەی ئەوها زۆرن دەربارەی ئەوەی کەقورئانی پیرۆز باسی علم دەکات هەتا رۆژی قیامەتیش رۆژ بەرۆژ ساڵ بەساڵ کو اجهزەو موختەبەراتی علمی رون دەبنەوە ئایەت بەئایەت، بزانە پێش هەڵدانی صاروخی رقم (١١) کە بەرەو مانگ فرێ درا پرسیارەك لەگۆڤاری (منبر الاسلام) لەقاهیرە کرا کە ئایا هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بەو رۆیشتنەی ناو مانگ چییەو ئایا دین و قورئانەکەی ئێوە لەم بارەوە هیچیان باس کردووە، ئەم گۆڤارەش لەعەددەی مانگی نیسانی (١٩٦٩)دا وەڵامی پرسیارەکەی داوەو واتە پێش (٣)مانگ چوونە ناو مانگ ئەو روونکردنەوەی بلاوکردەوە، چونکە صاروخەکە رۆژی ١٦-٧-١٩٦٩ دەستی پێ کرد، وە ئەوەی جەوابەکەشی داوە (دکتۆر محمد شوقی) بوو، دەڵێ پرسیارتان کردبوو لە هەڵوێستی اسلام بەرامبەر بە رۆیشتنی ناو مانگ، پێش (١٣٠٠ ساڵ لەمەو پێش قورئانەکەی ئێمە موژدەی دایە بە ئادەمیزاد کە هەروەختەك توانیتان دەسەلات پەیدا بکەن دەتوانن بچنە ناو ئەستێرەکانی ئاسمان.

نەك تەنها بۆ ناو مانگ بەڵکو بۆ دوورتریش لەمانگ، بەڵێ صاروخەکەتان دەتوانێ بروات بۆ ناو مانگ، هەڵوێستی ئیسلامیش دەقی قورئانی پیرۆزەکە دەفەرموێ (يا معشر الجن والانس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السموات والارض فانفذوا لاتنفذون إلا بسلطان). دەفەرموێ ((ئەی کۆمەڵی اجنەو ئادەمیزادان، هەروەختێك توانیتان بگەنە ئەو پلەی زانستی برۆن بەرەو کەوکەبەکانی ئاسمان و زەوی برۆن، بەلام (لاتنفذون إلا بسلطان)، بەلام ناتوانن برۆن، ئەگەر بەهێزو قووەت نەبێ، وەك صاروخی فضائی بەلام خۆ ئەگەر نەرۆیشتن و نەگەیشتنە ناو ئەو کەوکەبە ئەوە پلەی هێزەکەتان تەواو نییە)). بەڵێ ئەوەی کە ئێستا علم بەدەری دەخات لەسەر رووی زەوی ئایەتەکانی قورئان پێش (١٤٠٠) ساڵ باسی لێوە دەکات بەجۆرێك کە ئەوە دەسەلێ دەیکاتە بەڵگەو دەلیل لەسەر خودی قورئانی پیرۆز ئەمرۆ لەسەدەی بیست کە زانست و علم پێشکەوتووە، بناغەو سەرەتای ئەو کەونە بەغازە دووکەڵ دەزانن، دەی باشە ئەمرۆ بەم هەموو جهازو دەزگاو کۆمپیوتەرو بەم هەموو اجهزەی فضائی ئەوە دەڵێن ئەدی باشە کەی لەتواناو قوەتی نەخوێندەوارێکی وەك محمد مصطفى(د.خ) دایە، پێش (١٤٠٠) ساڵ ئەوە بزانێ کە أول و سەرەتای کەون پێك هاتبوو لە غازو دووکەڵ، ئایا پێغەمبەر(ص) لەجامعە و دانشگای امریکاو بریتانیا دەرچوو بوو لەعلومی فضائی خوێندبووی هەتا اکتشاف بکات و بلێ زەوی و ئاسمان لەسەرەتادا یەك پارچە بووینە، خەریجی پاریس و لندن بوو کەبلێ بناغەو سەرەتای ئەو کەونە غازو دووکەڵ بوون، بفەرموێ (أن السموات والارض كانتا رتقاً ففتقناهما) بلێ (ئاسمان و زەوی یەك پارچە بوون) بلێت (ثم أستوى الى السماء وهي دخان) بلێ سەرەتای ئەو کەونە غاز بووە، نەخێر خەریجی جامعەی (إقرأ بأسم ربك الذى خلق) پێغەمبەر(د.خ) ئەو ئایەتانەی کە بۆی هاتووە. نەتیجەی تەجربەی خۆی نییە وەکو مختبرات و جامعات و علومی فضائیات بەڵکو (وماينطبق عن الهوى إن هو إلا وحي يوحى علمه شديد القوى) بەڵکو ئەم قورئانە وەحیئیلاهییە بۆ پێغەمبەری مەزن(د.خ)، دەی باشە ئەگەر تا ئێستا بروا بەقورئان ناکەن، خۆ باوەر بەزانست و علم دەکەن.



# ئایینی پاکی ئیسلام راستیەکانی زیاتر دەدروشێنەوە بەهۆی کۆمپیوتەر




خوای گەورە کاتێك لەقورئانی پیرۆزدا پیناسەی مرۆڤ بە(لقد خلقنا الانسان من أحسن تقويم) دەکات بەزیرەکترین و ژیرترین زیندەوەری سەر گۆی زەوی دادەنێت و بەگیانەوەرێکی تەواوی بێ کەم و کوڕی خولقاندووە و هەڵگری پەیامی راستی و یەکتاپەرستی بێت، جیاکەرەوەی مرۆڤ لەگەڵ گیانەوەرەکانی تر بەبوونی ئەندامێکی بچووك کەکێشەکەی لە ٦٠٠ گغم تێ ناپەڕێت و پێی دەوترێت (مێشك) ئەمەش بۆ ئەوەیە کەخوای گەورە خۆی زیاتر پێ بناسێنێت و بەدڵێکی پڕ باوەڕیەوە بیپەرستێت و ببێتە بەندەیەکی نموونەیی.. کارەکانی رۆژانەی بەپێی پرۆگرامێك بێت کەخوای میهرەبان رازی بکات لەسەری و تەنها بۆ رازی بوونی ئەو بێت.. ئەم مێشکە بنکەی بڕیاردان و رێك خستنی کردارەکانی مرۆڤە، خاوەنی چەندین هەوڵ و کۆشش بێت بۆ فەراهەم کردنی ژیانی رۆژانەی خۆی، ئەمەش هەر هەمووی تەنها بۆ خزمەت کردنی بەندەی ئادەم بێت، هەندێك ئەرکی لەسەر کەم بکرێت، یەکێك لەو هەوڵانەی زاناکان کۆمپیوتەرە.

* *

کۆمپیوتەر وەك گشت ئامێرەکانی تر پێك هاتووە لەکۆمەڵە ئامێرێك و بۆ سێ ئەرکی سەرەکی داهێنراوەن وەك خێرایی جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و داگرتنی زانیاریەکان لەسەر شێوەی کۆگاکان و بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بێ ئەوەی زانیاریەکان تێك بچن، لەگەڵ وردبینیەکی بەکجار زۆرو بێ هەڵەی لەکردارەکانی.. بۆیە گرنگییەکی زۆری هەیە لەژیانی رۆشنبیری موسڵمانی ئەمڕۆکە دەیەوێت زیاتر ئاشناو رۆشنبیر بێت بەئایینی پاکی ئیسلام..

(١)

لەنەوەدەکانی سەدەی بیست و دوای ئەوەی ئایینی پاکی ئیسلام وەك رۆژانی رابردوو توانی بەرامبەر هەوڵە نەزۆکەکانی دوژمنان وەك چیایەکی روو لەئاسمان بووەستێت کەدەیان وت ئاینی پاکی ئیسلام ناتوانێت مامەڵە لەگەڵ نوێ ترین و بربڕاگەی شارستانیەت بکات.. بەڵام دوای هەوڵی زۆری کۆمپانیا ئیسلامیەکان بەتایبەتی رۆڵی کۆمپانیای (العالمیە)ی سعودی هەر لەقورئانی پیرۆزو فەرموودە پیرۆزەکانی تا دەگاتە دابونەریت و بنچینەکانی ئاین و ئێمە لێرە هەوڵ دەدەین چەند راستییەك روون و ئاشکرا بکەین و خەڵکانی لای خۆمانیش بتوانن بەکاری بهێنن و سوودو گرنگی بزانێت.

لەسەرەتا پرۆگرامێك بەناوی (سلسبيل) لەلایەن کۆمپانیای (I.B.M)ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەوتە بەر دەستی بەکارهێنەران، هەرچەندە ئەم پرۆگرامە پێك هاتبوو لەکۆمەڵە دەستەواژەیەك و یەکەجار قورئانی پیرۆزدا کراوەتە کۆمپیوتەرو بەمەش هەتا دونیا ماوە ئەم قورئانە پیرۆزە بەم شێوەیە بمێنێتەوەو نەتوانرێت بشێوێنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵە گیروگرفتێکی تووش بوو وەك ئەوە زیاتر بەزمانی ئینگلیزی مامەڵەی لەگەڵدا دەکراو خەڵکانێکی زۆری ئینگلیزی نەزان بێ بەش بوون لێی.

لەلایەن کۆمپانیای (العالمیە) پرۆگرامێك دانرا بەناوی (القران الكريم) بەماوەی دوو ساڵ و نیوو لەدوو گروپ پێك هات و گروپێکیان ئەرکی تەکنیکی لەئەستۆ گرتبوو وەئەوەی تریان لایەنە شەرعی و ئایینیەکانی بەئەستۆ گرتبوو بە٢٤ کاتژمێر کاریان تێدا دەکرد.. ئەم پرۆگرامە بەتاجی پرۆگرامەکان دادەنرێت و وە لەلایەن زۆربەی کۆمەڵگە ئایینیەکان و زانستیەکان باوەڕ پێ کراوەو مۆری خۆیان لەسەر هەر دانەیەك داناوە وەك دانیشگای (ام القرى) و زانکۆی ئەزهەرو وەزارەتەکانی ئەوقافی دەوڵەتە ئیسلامییەکان.. بەکارهێنەر گەر یەك کاتژمێر بەرامبەر ئەم ئامێرە زانیاری وەرگرێت مقابلی ٢٣ ساڵی گۆشەگیریە لەمزگەوتەکان و پەراوەی پەرتووکەکان لابەلا بکاتەوە.. لەنوێ ترین نێردراوی لەژێر ژمارەی ٣١ر٧ بۆ ساڵی ١٩٩٧ کەبۆ هەردوو کۆمپیوتەری جۆری (I.B.M) و صخر بەکاربهێنرێت. ئەم پرۆگرامە پێك هاتووە لەچەند بەشێك وەك:

- گەڕان و پیشاندان: ئەم بەشە پێك هاتوو لەگەڕان بەدوای هەر وشەیەك کەداوای لێ بکرێت و بەماوەیەکی کەم دەزانرێت.

- ئامار: پێك هاتووە لەژمارەیەکی زۆری ئامارەکە بەکارهێنەر پێویستی پێی دەبێت، وە لەهەر سورەتێك ئامارەکە دەزانرێت بەشێوەی هەر پیتێك بۆ نموونە پیتی -أ- یان -ب-...هتد ئەجارە ئامار دەربارەی سوورەتەکان و



ڕێکخستنیان جا چ بەپێی دابەزینیان بێت بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ).

- زانیاری دەربارەی قورئانی پیرۆز: وەك ناوی ئەو زاتانەی کەقورئانی پیرۆزیان لەبەر بووەو نووسیویانەتەوەو بەم ڕۆژەیان گەیاندووەو زانیاری بەشێوەیەکی زۆر چڕو پڕ دەربارەی ئەو پێغەمبەرانەی کەلەناو قورئانی پیرۆز ناویان هاتووە یاخود سەرگوزەشتەیان باس کراوە، لەگەڵ نزاو پاڕانەوەی تەواوکردنی قورئانی پیرۆز (دعاء ختم القران).

ڕاڤە (تفسیر): ئەم پرۆگرامە لەهەر شوێنێك بێت‌و پێویستیت بەتەفسیری ئایەتێك بوو ڕاستەوخۆ بەسێ زمان دەردەکەوێت جا بەعەرەبی یان زمانی ئینگلیزی یان زمانی فەرەنسی. هی زمانی عەرەبی دوو تەفسیرە یەکەمیان تەفسیری جەلالین لەگەڵ هۆیەکانی دابەزین‌و تەفسیری ابن الکثیر کە لەلایەن کۆمەڵگە ئیسلامیەکان زۆر گرنگ‌و پڕ بەبایەخن.. ئەوەی زمانی ئینگلیزیە کەلەدەزگای (امانا) لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەساڵی ١٩٨٩ چاپ کراوەو ئەوەی بەزمانی فەرەنسا تەفسیر کراوی شێخی پایەدار محمد حمیداللە کەساڵی ١٩٨٦ لەلایەن چاپخانەی (الرسالە) لەبیروت- لبنان چاپ کراوە.

چەند وێنەی شوێنەوارە ئیسلامیەکان: ژمارەیەك وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی قەشەنگ وەك وێنەی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)و چیای عەرەفەو مزگەوتی قدس‌و ئەزهەرو مزگەوتی ئەمەوی لەدیمەشق‌و چەندانی تر.

خوێندنی قورئانی پیرۆز: دوای ئەوەی قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوەی موسڵمان خۆی فێرە قورئان خوێندن بکات‌و بەدەنگی سێ قورئان خوێنی پایەبەرزی ئیسلامی ئەمڕۆ وەك دەنگی زوڵاڵی شێخ محمد صدیق منشاوی، شێخ عبدالباسط شێخ عبدالصمدو شێخ الحصری وە لەتوانای بەکارهێنەر دایە کەدەنگی خۆشی تۆمار بکات‌و گوێ بیستی دەنگی خۆی بێت.

ئەم پرۆگرامە هەرچەندی لەسەر بنووسرێت ناگاتە تروکێکی ئەو هەموو خزمەتەی موسڵمانی گەڕۆك بەدوای ڕاستی دەگەڕێت پێی دەبەخشێت..

(٢)

لەلایەن کۆمپانیای (العالمیە) ئەمجارە پرۆگرامێکی تر بەناوی (الحدیث الشریف) کەوتە بەردەستی بەکارهێنەران کەزیاتر لە٦٦٥٠ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)ی گرتۆتە خۆ... وە هەر فەرموودەیەکیش ژمارەیەکی دراوەتی لەکاتی بانگ کردنی ئەوا زانیاری تەواو دەربارەی ئەم فەرموودەیە بەبەکارهێنەر دەدات وەك چ زاتێك ریوایەتی کردووەو تا چ ڕادەیەکیش پشت ئەستوور بەڕاستی‌و دەکەوێتە چ گرووپێك وەك فەرموودەکانی صحیح‌و حسن‌و...هتد. لەگەڵ ژیاننامەی هەردوو ئیمامی موسلم‌و بوخاری‌و ڕۆڵی گرنگیان بۆ پاراستن‌و مانەوەی فەرموودەکان هەیە.

(٣)

هەر لەلایەن کۆمپانیای ناوبراو کۆمەڵە پرۆگرامێك دانراون تەنها بۆ زیاتر ڕۆشن کردنەوەی بیری موسڵمانی سەردەم‌و بەتایبەتی دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەوڵاتە ئەوروپییەکان‌و ئەمریکا دەژین‌و بەزۆری کۆمپیوتەر بەکاردەهێنرێن‌و بۆ ئەوەی لەجیهانی ئیسلامی دانەبڕێن.. لەسەرەتا گرنگترین پرۆگرام لەم بوارە بەناوی (الوقت المثالی) کەزیاتر بۆ زانینی کاتی نوێژەکان‌و شوێنی قیبلەیە بەپێی ئەو شارەی لێیەتی لەگەڵ دووری شارەکە لەکەعبەی پیرۆز جا چ ئەم موسڵمانە لەلەندەن بێت یان پاریس یا میشیگان.. زانینی ڕۆژە پیرۆزەکانی ئیسلامی وەك ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)و ڕۆژی ئیسراو میعراج...هتد، نیشان دانی نەخشەی جیهانی‌و ئامارێك دەربارەی ئەو وڵاتانەی کەئایینی ئیسلامی تێدایە...

(دروس من السیرة) پرۆگرامە ئامادەکراوە بەتایبەتی بۆ منداڵەکان‌و پەندی لێ وەربگرن وەك شیکردنەوەی شەوی ئیسراو میعراج‌و چۆنیەتی ڕوودانی چۆنیەتی ڕوودانی ساڵی فیل. لەگەڵ بەکارهێنانی مۆسیقایەکی هێمن کەبتوانێت زیاتر دڵگیری بکات...

(رحلة الی مکة) ئەم پرۆگرامە تایبەتە بەچۆنیەتی حەج کردن‌و لەدوو شێوە پێك هاتووە وەك مێژووی شاری مەکەی پیرۆزو بەوێنە دەردەخات ڕێنمایی دەربارەی چۆنیەتی حەج کردن هەر لەو کاتەی لەفڕۆکەخانەی مەلیك خالید دادەبەزیت تا دەگەڕێیەوەو خەڵکی پێت دەڵێت حاجی، لەکۆتاییدا ژمارەیەك پرسیارت لێ دەکات بۆ ئەوەی بزانێت تا چ ڕادەیەك سوودت وەرگرتووە لەم پرۆگرامە.

(الارکان الخمسة) شی کردنەوەی هەر پێنج بنچینەکانی ئایینی پاکی ئیسلام لەشەهادەت هێنان‌و نوێژ کردن‌و بەرۆژوو بوون‌و زەکات دان‌و چوونە ماڵی خوای گەورەو میهرەبان بەشێوەیەکی زۆر جوان‌و سادەو ساکار.

* * *

کۆمپیوتەر بۆتە هۆیەکی سەرەکی بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر زیاتر بەفەلسەفەی ئیسلام‌و خووڕەوشتی پاکی ئیسلام ئاشنا بن، بەمەش وەڵامێکی هێمنە بۆ ئەو مرۆڤانە دەداتەوە کەوایان دەزانی ئیسلام ڕێ گر بێت لەبەردەم زانست‌و داهێنان یان دەزانی ڕۆژانی زێڕینی ڕابردووی مزگەوت مەڵبەندی پێش کەوتن‌و دروست کردنی ئامێر بێت‌و لەکاتی بینینی ئەوروپیەکان سەریان لێ بشێوێت‌و خوای گەورەش پاداشتی ئەو زانایانە بداتەوە کەڕۆژو شەو لەهەوڵ تەقەلادان بۆ زیاتر خزمەت کردن.





# لە تای تەرازووی ململانێی نێودەوڵەتیدا

موحسین چینی

لە دووەمین گرێی چەرخی نۆزدەما ، بانگەوازە بە سۆزەکانی ناپلیۆن ، گەلانی چەوساوەی ژێر دەستی ئیمپراتۆرە نەهەنگەکانی وەک ئەڵمان و نەمسا و روسیا ، هەروا سەرکارە دیکتاتۆرەکانی وەک ئیتالیا و ئیسپانیا و دەیان میرنشینی دیکەی گۆرەپانی ئەوروپا و دەوروبەری بە بیروباوەڕی دادوەری و یەکسانی و سەربەخۆیی راپەڕاندو هێنایەهەژانەوە ، گەلانی ئەم ناوچانەلەوکاتەی هێزەکانی ناپلیۆن دەگەیشتنە ناوچەکانیان بەلێشاو پێشوازیان لێدەکردن بەدڵی پڕ لە هیواوە ئامێزیان بۆ دەکردنەوە ، ناویشان لێنابوون ، هێزی رزگارکەر.

کەچی هێشتە هێندەی پێنەچوو ، رزگارکەر بووە داگیرکەر شەڕوئاژاوەو پێکدادان ، دێهاتی کاول کردن ورەوکردنی دانیشتوان ، سوتاندنی خەرمانی سووری جوتیاران ، دەستی پێکرد .لەماوەیەکی کورتی تەمەنی ٢٠ ساڵی ملهوری ناپلیۆن پتر لە یەک ملیۆن کەس کوژراو پتریش لە ملۆنێک بریندار بوون ، شارەزایانی مێژوو وا مەزندە دەکەن لەوماوەیە پتر لە (٥) ملیۆن دێهاتی دێیەکانی خۆیان بەجێ هێشت.

لەو سەردەمە ، کە فەرمانی توندوتیژی بەکار دەهێنا ، ناپلیۆن نەیتوانی کێشەکانی نەتەوەیی چارەسەر بکات لەگەڵ ئەمەشدا نەیتوانی چارەی کێشەی نەتەوە بچوکەکانیش بکات ، کەوابێت لەو نێوەندە مەسەلەی کەمایەتیەکان وەک خۆی مایەوە ئەگەر نەڵێین پتر زیانیشی پێکەوتبێت ئەمانە بەگشتی لە لایەک ، لە لایەکی دیکەوە ، ناپلیۆن فەرەنسەوی رەسەن نەبووە ، خەڵکی ناوچەیەکی داگیرکراوی کورسیکا بووە ، لەم حاڵەتە ناپلیۆن کە دەبێتە ئیمپراتۆری فەرەنسا ، هیچ هەستێکی نەتەوەیی فەرەنسەوی نەبووەکە کێشەی گەلانی دیکە چارەسەر بکات ، تەنیا هەموو ئاواتی ئەوە بووە ، گەلانی دنیا دەبێت بەگشتی لە ژێر فەرماندەی ئەودا بن.

ئەو سەردەمە پتر لە ٦٠ ساڵی خایاند ، ناپلیۆنی یەکەم و دووەم و سێیەم... مەسەلەی نەتەوەو کەمینەکانیان پتر ئاڵۆزکردەوە ، گیروگرفتی نێوان گەلانیان پتر گەرم کرد ، شاڵاوی رق وکینەی گەلان بەرانبەر بە یەکدی پتر بەرز بووەوە لەکۆتایی ئەم سەردەمە ، بیروباوەری سۆشیالیزم سەری هەڵداو دیسان لە فەرەنساوە دەستی پێکرد ئەم فەلسەفەیە بە شێوەیەکی سادە سەرانسەری ئەوروپای گرتەوە ئەڵمانیاو فەرەنسای بە توندی هەژاندەوە. لە ئەنجامی تەشەنە بوونی ئەو فەلسەفەیە ، گەلان یا کەمینەکان بەو هیوایە بوون ئەمە پوختی پێشکەوتنی مێشکی مرۆڤەو ، کۆمەڵی مرۆڤایەتی گەیشتووەتە ئەو رادەیەی لە پێشکەوتنی فیکر ئیتر کێشەکان چارەسەر دەکرێن لەمانەش کێشە نەتەوەییەکان ، بەهەر حاڵ هەموو چین و توێژو دەستەکانی گەلان لەو باوەڕەدا بوون هەموو مەسەلە گرنگەکانی میللەت لە فەلسەفەی سۆشیالیزمیدا چارەسەر دەکرێ.لەمەشدا وتە بە نرخەکەی ئەبراهام لنکۆلن ی یەکەم سەرۆکی ئەمەریکا کە جاری مافی چارەنووسی گەلانیدا ، هاتە گۆڕێ و پتر مشتومڕی لەسەرکرا. ئیتر شۆڕشی ئۆکتۆبەری





ساڵی ١٩١٧ لە روسیا، وەک (سەکۆبەکی ئازاد) بۆ دەنگی گەلانی خۆی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەو کەمینەکان چەسپاند... بەلاَم بە داخەوە، بۆ ماوەی ٧٠ ساڵ کە لە سەدا ٦٥٪ ی رووبەری دنیای بەدەستەوەبوو، یەک لەسەر شەشی دانیشتووانی دنیای بەڕێوەدەبرد، لەجیاتی ئەوەی چارەسەری ئەم مەسەلە جەوهەرییەی ژیانی مرۆڤ بکات، سەیر دەکەین ئەوەی لەسەردەمی ستالیندا لە دژی ئەو گەلانەکراوە لە هیچ سەردەمێکی مێژووی دوورو درێژی روسیا تا لە سەردەمی ئیڤانی تۆیینەریش نەکراوە. دووبارە دەڵێین بە داخەوە کە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ ی روسیا لە ئەنجامی ململانێی سێ جەمسەری - لینین -ترۆتسکی ستالین- لە هەموو دروشمەکانی پێشتری پاشگەز بووەوە، لێدانێکی کوشندەی لەناو جەرگەی مەسەلەی کەمینە نەتەوەییەکاندا بەتایبەتیش مەسەلەی کوردە موسڵمانەکان.

ململانێیە سێ جەمسەرییەکە، کێشەکانی پتر ئاڵۆز کردەوە، جێگۆرکێیەکی گەورەی لەنێو کەمینە نەتەوەییەکانداکرد، ئەو جێگۆرکێیە فراوانە گەیشتە رادەیەک سیمای ئیسلامەتی لە هەر پێنج کۆماری ئاسیای ناوەراستدا شێواند. سنووری میللی نێوان گەلانی پتر بەزاند ئەو ئاڵۆزییە بەربلاوە گەیشتە ئەو رادەیەی، روسیای ئێستە هەروگیڤی لێبکرێت کە لەماوەیەکی نزیکدا بکرێتە دەیان پارچە. (بۆ ئەمە پێشنیارەکەی - جێمس بیکەری وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمەریکا دەکەینە نموونە کە بۆ چارەسەری مەسەلەی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا و ناوچەی ئۆتۆنۆمی پێشنیار کرد).

ئەگەر سۆشیالیزم بۆ ماوەی ٧٠ ساڵ ئەم کێشەیەی کەمینە نەتەوەیی و مەزهەبییەکانی پێ چارەسەر نەکرا، هەر وەک ناپلیۆن پۆناپارتیش ماوەی ٢٠ ساڵ نەیتوانی چۆن چارەسەری بکات.

ئێستا نۆرەی دیموکراتیزمە. لەزانستی کۆمەڵدا هاتووەو دەڵێین - پۆناپارتیزم - سۆشیالیزم - دیموکراتیزم، بۆ چارەسەری کێشەی نێو گەلان بەتایبەتی کەمینەو مەزهەبییەکان، سێ هەنگاوی مێژوویین و پێویستە وەک سەردەم لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت.

پێش ئەوەی بێینە سەر باسی چۆنیەتی چارەی مەسەلەی میللی یا مەزهەبی. ئێستا دیموکراتیزم وەک ئاگری ژێر پووش بووەتە تاکە دەرمانی ئەم مەسەلەیەو ئاسۆی هەموو رێگەکانی وەک تارمایی داپۆشیوەو پەرژینی گەورەی لەبەر دەم گشت چارەسەرییەکانی دیکەی دروست کردووە.. یا بە شێوەیەکی دیکە کە دەڵێین فەلسەفەی دیموکراتیزم بێچەوانەی فەلسەفەی دیکتاتۆریزمە کەواتە بەبێ سێ و دوو و بەبێ لێکدانەوە دەبێت بەوە قایل بین کەدیموکراتیزم نەک تەنیا مەسەلە کەمینەکان بەڵکو مەسەلە مەزهەبییەکانیش لە ژێر سێبەریدا چارە دەکرێن و رووی رووناکی دەبینن. ئیتر ئێستا سەر کاروانی ئەم رەوکردنەی مرۆڤایەتی بەرەو ئاسۆی دیموکراتیزم، نازانین لاپەڕەکانی چەند ساڵەی داهاتووش چیمان لەدەست یەک جەمسەری جیهان بۆ دەنووسێت و چارەنووسمان لەم بارودۆخە نوێیە تاقی نەکراوەیە چۆن دەبێت، لەمەشدا هیچ کەسێک ناتوانێت گرەنتی ئایندەیەکی پڕ لە بەختیاری و سەرفرازی بۆ کەمینەکانی بدات مەگەر تەنیا بۆ فروفێڵ لێکردن و لە خشتەبردنی خەڵکی دیکەو بەرژەوەندی تاکە حزبەکەی خۆ نەبێت. هەموو جوولانەوەی کۆمەڵ یاسای فیزیایی بەرێوەی دەبات، هەر فەلسەفەیەک گەر لە شوێنی رەسەنی خۆی تاقی نەکرێتەوە، مەحاڵە لە شوێنێکی دیکەی دوورتر سەرکەوتن بەدەست بێنێت. بە هەر حاڵ ئەگەر بێتو دیموکراتیزمیش چارەی تەواوی کێشەی نێو گەلانی نەکرد، بێگومان پێویستە ئەم کەمینانە ماوەی دەیان بەڵکو سەدان ساڵی دیکە چاوەروان بن تا ئەوکاتەش جیهانگیری چادرێکی تەراو بەسەر گێتیدا دەپۆشێت و ئەوەی نەتەوەی گەورەیە نەتەوە بچووکەکان دەتوێنێتەوە لە ئاشی زانستدا ووردو خاشی دەکاتەوە.

لەمەسەلەی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا وتەیەکی هیتلەرم بەیاد دێتەوە کە دەیگوت: سەیرە، ئەو پۆڵۆنییە بێ ئابرووانە لەمێژوودا هیچ رۆڵێکیان نییەو لەهەر شەرو پێکدادانێکی نێو گۆرەپانی ئەوروپاشدا، پارچەیەک لەوڵاتانی دیکە جیا دەکرێتەوەو خاکی پۆڵۆنیای پێ گەورە دەکرێتەوە.. (لەسەدا ٣٨ ی خاکی پۆڵۆنیا لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانی بۆی زیادکراوە زۆربەی ئەو زەوییانەی بەسەر خاکی پۆڵۆنیاوە دەنران خاکی ئەڵمانیا بوو، کە هاوپەیمانان لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانی سزای ئەڵمانیایان داو خاکیان لێدابرکردو بەپاڵ خاکی پۆڵۆنیایانەوە نا).



ئەگەر وتەکەی هیتلەر بەراست لەقەڵەم بدەین، دەڵێین ئێستاش و لە کۆنەوەش مێژوو هەرگیز بەم شێوەیە بەڕێوەبووە، هەر گەلێک لە ڕەوتی خەباتدا بیەزێت، بنەمای تێکدەچێت، یا دەڵێین هەرگەلێک یا کەمینەیەک لەنێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا جموجۆڵی مرۆییانەی نەبێت، ئەو گەلە یا کەمینەیە کە کارەساتێکی لێ ڕوو دەدات گەلان بە هانای نایێن ( ٧ ملیۆن پەنابەری ئەفغانی/ ٣ ملیۆن ڕەوکەرو لەبرسان مردووی سۆمال، کوژرانی ئیسلامەکانی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا. کۆچ کردنی خەڵکی کوردی هەرێم بۆ هەندەران و کوژەوە سێ ملیۆنیەکەی کورد ...)، جاری واش هەیە لە هەندێک ناوچەی گەرمی سیاسەتی نێو نەتەوەییدا کەکێشەیەک ڕوودەدات ئیتر دەوڵەتان بەگشتی کە لەکەی دەکەن و کێشەکە ئەگەر بە توندی بێت یا بە شێنەیی بێت چارەی دەکەن وەک کێشە گەرمەکەی یۆگوسلافیا.

که ئەمەریکا ٦٠ هەزار سەربازی بۆ ئەم ناوچەیە لەڕێگەی UN. دوە ڕەوانەی ئەم ناوچەیە کردو لە ژێر چاودێری کارمەندانی UN. دوە هەڵبژاردنی تێدا سازکردو بەمەیش دەستی زۆردارانی تێدا بڕی.. کوردیش کەی ئەمەی بۆ دەکرێت ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە ... هەر بەم شێوەیەش ئەگەر کەمینەیەک لە نێو گەلێکی دیکەدا لەجموجۆڵی گشتی دەوڵەتدا بەشداری نەکات، ئەم کەمینەیە وردە وردە لە سیاسەتی نێو نەتەوەییدا دوور دەکەوێتەوە، بەیەکجاری لەکاروانی مێژوو دادەبڕێتەوە، ئێستا سەیر دەکەین لە هیندو چین سەدان کەمینە هەیە جموجۆڵی ئەماوە بنەمای میللی وەک کەمینە تێکچووە ( لە هیندستان کەمینەکان بە گشتی بە زوبانی ئۆردی زوبانی ڕەسمی هیندستان، لەچین بە زوبانی چینی دەدوێن).

لە سیاسەتی هەندێ دەوڵەتانی ئیستعماریشدا، داگیرکەران لەو دەوڵەتانەی تێیدا دەست ڕۆیشتووبوون، لەدژی زۆرینەی خەڵکی ئەم وڵاتە بایەخیان بەکەمینەکان دەدا، لەمبارەیەوە پیاوی کەمینەکانیان دەکەنە وەزیری بەرگری و ناوخۆو یا سەرۆک وەزیر..بەمەیش کێشەیەکی گەورە بۆ زۆرینەکان ڕووی دەداو مەسەلە ململانێیەکەی دەکردە مەسەلەیەکی ناوخۆ داگیرکەران تێیدا دوورە پەرێز دەوەستان.

ئەم سیاسەتەی ئێستای حکومەتی سربستان هەمان سیاسەتە کۆنەکەی سەردەمی بابەوییەتە کەلەچەرخەکانی سەرەتای دامەزراندنی مەسیحییەتەوە تا ئێستا پەیڕەو دەکرێت.. ئەم سیاسەتە لەسەریەک بنەما بەڕێوە دەچێت ئەویش ئەوەیە کەدەسەڵات (سەربازی) لەهەرشوێنێک بکێشێتەوە یا پاشەکشە بکات.. سەربازی داگیرکەر یا گەلە داگیرکەرەکە لەو وڵاتە دەکشێتەوە، بەڵام دەسەڵاتی بابەوییەت ناکشێتەوە.. بەگوێرەی ئەم بنەمایە ..ئەگەر دەسەڵاتی سربەکان لەبۆسنە بکشێتەوە، سەربازو داودەزگەکانیان بکشێتەوە، بەڵام نابێت ڕۆحی کلیسە لەو ناوچانە بکشێتەوە.. ئینجا کە ئەو خەڵکەش موسوڵمان بن و بۆ نوێژکردن بیانەوێت مزگەوت دروست بکەن ئینجا ئەم حاڵەتە سوریالییە چۆن دەگونجێت کە تۆ موسوڵمان بیت وباسی ڕۆحی مەسیحم بۆ بکەیت..

ئەوەی ڕاستی لە دوای سەردەمی زێڕینی بڵاوبونەوەی ئایینی ئیسلام ڕۆحی ئیسلامەتی ـ وەک دەسەڵات ـ سەرانسەری ناوچە زۆر دوورەکانی وەک ناوەڕاستی ئاسیاو چین و هیندستان و پاکستان و ئەفغانستان و مالیزیاو بۆرماو ئێران و تورکیاو ئیسپانیاو باشووری ڕۆژئاوای فەرەنسا دەوڵەتانی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقیادا بەرەو لاوازبوون چوو پەیتا پەیتا کشانەوە، واتە هێزی (سەربازی دەسەڵات)، لەوناوچانەدا پاشەکشێیان کرد..سەربازە عەرەبە موسوڵمانەکان لەو ناوچانە کشانەوە بێ ئەوەی هیچ کوت و مەرجێک بۆ گەلە بەجێ ماوەکان بەجێ بهێڵن. سەیری عەقڵی دواکەوتووی سربەکان لەوەدایە سەرەڕای تێکشکان و بەزینیان لە گۆڕەپانی شەڕو ڕاکردنیان دەیانەوێت لەو ناوچانەی بە جێیان هێشتووە کلیسەکانیان هەرگیز نەبێت و نەبینی ڕەسمی دەوڵەت مەسیحی بێت ئەگەر چی زۆرینەش موسوڵمانن.. ئینجا ئەگەر بەم پێیە سەیری مەسەلەکە بکەین دەبوایە تا ئێستاش شەڕێکی سەردەمی سەلاحەدین تەواو نەبوایە یە ئەو شوێنانەی کە عەرەبە موسوڵمانە دێرینەکان لە ناوچە زۆر دوورەکان بەجێیان هێشتن دەبوایە ئەم ناوچانە تائێستاش موسوڵمان بوونایە کەچی بە پێچەوانەوە لە دوای پاشەکشەی هێزی موسوڵمانەکان خەڵکی ناوچەکان ئەوانەی پێشتر مەسیحی بوون وەک وڵاتەکانی ئیسپانیاو بەشێکی پورتوگال و باشووری ڕۆژئاوای فەرەنسا، خەڵکەکە بە گشتی بوونەوە



مەسیحی و مزگەوتەکانیان تێکداو لەهەمان شوێندا جا کڵێسەیان دروست کردنەوە.. لەناوچەکانی وەک بۆمباو هیندستان خەڵکەکە بوونەوە بت پەرست و گاپەرست وازیان لەئاییینی ئیسلام هێنا، مزگەوتەکانیان تێکداو پەرستگەی پێشتریان لێدامەزراندنەوە. هەروا لە چینیش ئیسلامەکان لە دوای شکستی دەوڵەتی ئیسلامی تیایدا بوونەوە کۆنفۆشیۆسی و لە شوێنی مزگەوتەکان پەرستگەکانی پێشوویان تێدا بەرزکردەوە.. ئەمەو بەدەیان حاڵەتی دیکە کە لەسەرانسەری دنیای زۆر دوور رووی داو دەوڵەتی ئیسلامیش پێی قایل بوو، بڕیار بەدەستانی مەککەو مەدینەش هیچ نەیانگوت ئەم دەوڵەتانە بوونەتەوە کافرو پێویستە سەربڕێن، وەک ئەوەی لەکڵێسە گەورەکانی دنیا فەتوای ئەوەیان دەدا کە خەڵکی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا کافربووە کە لە دوای ٤٥ ساڵی دەسەڵاتی فەلسەفەی ماددی چۆن دەبێت نوێژ بکەن، کەواتە کوشتن و سەربڕین و زیندەبە چاڵ کردنی بەکۆمەڵیان ڕەوایە.

## لەبەرچی ئیسلام لەبۆسنەو هەرسەگۆڤینا قەلاچۆ دەکرێت؟؟

بۆ پتر تێگەیشتنی مەسەلەی تەنگژەی گۆڕدیانی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا دەتوانین بڵێین تەنیا مەسەلەی ئیسلام نییە. بەڵکو مەسەلەکە. مەسەلەیەکی نەتەوەیی وگشت ئەو خەڵکەی بولقانە کەلە چوارچێوەی ئەو ناوچەیەدا دەژین. ئەمە ئەگەر بگەڕێینەوە سەر چۆنیەتی پێکهێنانی دەسەڵات بە دەوڵەتە ژێر چاودێرییەکان، سەیر دەکەین لەو دەوڵەتانەی زۆرینە شیعەبووە. داوودەزگەی دەوڵەت دراوەتە دەست سوننە (عێراق) هەروا لەو دەوڵەتانەی زۆرینە سوننە بووە داوودەوگەی دەوڵەتیان داوەتە دەست شیعە (سوریە) ئەمەو بەم پێودرە داوداەزگەی دەڵەتانی باکووری ئەفەریقیاشیان بەگشتی بەم شێوەیە ڕێک خستووە. لەزۆربەی دەوڵەتە ئەفەریقیایەکانیش داو دەزگەی دەوڵەت لەدەست هۆزە بچووکەکانەو ئەمەش جگە لەوەی کە پتر لە سەد ساڵ لە کۆماری باشووری ئەفەریقیا دوو ملیۆن کەسی سپی دەسەڵاتیان بەسەر چل ملیۆن کەسەدا کێشابوو. هەندێک سەرچاوە دەدرکێنن کە لە ساڵانی ناوەندی چەرخی شازدە تا ناوەڕاستی چەرخی نۆزدە کەدەکاتە ٣٠٠ ساڵ تەنیا لە ئەمەریکا پتر لە (٥) ملیۆن هیندییە پێست سوورەکان کوژراون، هەروا لەو ماوەیەشدا پتر لە ئەو ملیۆن پێست ڕەشە ئەفەریقاییەکان لە کاتی ڕاپێچ کردنیان بۆ ئەمەریکا لە نێو ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا خنکاون. .ئەمانە لە لایەک و لە لایەکی دیکەی مێژووی نەختێک کۆنیشدا (سەردەمی ناپلیۆن) ناپلیۆن بە ناڕەزووی خۆی زەوییەکانی (وڵات و هەرێمەکان) ئەورووپای بەسەر خزم وکەسانی جۆزفینی ژنی دابەش کردو لەسەر ئەو ناوچانە دەیکردنە میر. .حاڵەتی ئەورووپا و گاڵتە پێکردنی هەستی گەلان گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئەوەی شەوێک جۆزفینی لە مەیخانەکان ناسیبا، ناپلیۆن دەیکردە میرو بەسەر هەرێمێکدا دەیسەپاند کەواتە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان سیاسەتمەدارانی ڕۆژئاوا بە میزاجی سەمای شەوانەی جۆزفین هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مافی گەلان کردووە، ئەم حاڵەتە شێواوەی پێش سەدەیەک، بۆ ئەوەی ئێستەمان ئەرکێکی گرانەو چارەسەی ئەوهەموو ئاڵۆزییە زۆر زەحمەتە..

لە ڕاستیدا کە کاتێ ئیسلام لە ئەورووپا دەسەڵاتدار بوو نە لە سەردەمی کۆندا ونە لە سەردەمی عوسمانییەکانیشدا ئەوحاڵەتە ڕووی نەداوە.لەو کاتەوە کە ئیسلام لە ئیسپانیا پاشەکشەی کرد تا ئێست گیروگرفتی مەزهەبی تێداڕووی نەداوە... هەروا لەوکاتەوە کەعوسمانییەکان لە وڵاتانی ڕۆمانیا هەنگاریا، نیوەی نەمسا. بولگارستان، یۆنان، یۆگسلاڤیا وناوچەکانی دیکەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا بوون و دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو لە (والی) پتر کەسێکی دیکە نەبووە تا بارودۆخ و بنەمای نەتەوەیی وجوگرافیای ئەم گەلانە تێک بدات و وەک ئەوەی ڕۆژئاواییەکان کردیان بە هیچ جۆرێک چاک نەبێتەوە...

لەو وڵاتانە بەگشتی، داودەزگەکانی دەوڵەت لەدەست مەسیحییەکاندابووە. بە چاوی یەکسانی سەیری مەسیحییەکان کراوە. هەروا لە سەرانسەری ئەم وڵاتانە بازرگانی کەدەکاتە بڕبڕەی دەوڵەت هەمیشە بە دەست بازرگانە مەسیحییەکاندا بووە.

کێشەی بولقان لە (موحەمەد ئەلفاتیح) وە دەست پێدەکات کە ساڵی ١٤٦٣ لە هێرشێکی خێرادا



ژنەی داگیر کردو میردەکەی کوشت. ساڵی ١٤٨٢ هەرسەگۆڤیناشی داگیر کرد.نیتر ـ محەمەد ئەلفاتیح لەم ناوچەیەدا لەشکری پاسەوانی پێکهێناو دەسەڵاتی خۆی بۆ باکوورو شوورو ڕۆژئاوا فراوان کردەوە تا گەیشتە سەرقەراغی دەریای ئەدریاتیک..نینجا خەڵکی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا لەچەرخی پازدەم شازدەمدا بەلێشاو ڕوریان لە ئاینی ئیسلام کردوهەردوو ناوچە لە ڕووی کارگێرییەوە بوونە پارچەیەک لەخاکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.لەبەر ئەوەی ئەم دوو ناوچەیە ڕێژەی مەسیحییەکان پتر بوو، بۆیە بزوتنەوە میللی و سیاسییەکان هەرگیز بەدەست مەسیحییەکانەوە بوو.

لە ئەنجامی بە لکاندنی ناوچەی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا بەخاکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە چەندین شۆڕش بە سەر پەرشتکاری مەسیحییەکان ڕووی داوە. شۆڕشێکی دوور خایەن ١٨٥٢ ـ ١٨٦٢ لە هەرسەگۆڤینا هەڵگیرسا. شۆڕشێکی دیکە ـ ١٨٥٨. لەنێوەندی ئەوماوەیە لە بۆسنە سەری هەڵدا.بەڵام بەگشتی مەسیحییەکان سەرکوت کرانەوە.لە ئەنجامی پێشکەوتنی پێوەندییە ئابوورییەکان و هاتوچۆی خەڵکی ئەو ناوچەیە لەگەڵ دەوڵەتە مەسیحییەکانی دەوروبەری سربیا ومەقدۆنیاو چیای ڕەش و سلۆڤینا دیسان لە چەرخی هەڤدەهەم لە ڕووی عوسمانی و سوپای پاوانی ناوچەیی کە لە موسڵمانەکانی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا پێکهاتبوو شۆڕشێکی دیکەی گەورەسەری هەڵدا. لە ئەنجامی زنجیرە بەرهەڵستکاییەکان کەلە سەداسەدی مەسیحییەکان بوون ساڵی ١٨٧٥ شۆڕشێکی زۆر گەورە بەرپا بوو، هێزەکانی سوپای پاسەوان زۆربەتوندی وەڵامیان دایەوە، بەڵام ئاگری نەکوژایەوەو لەنێوەندەکە تەنگژەی پتر کردەوە لەدوای چەند مانگێک ـ١٨٧٦. ئاکامی شەڕو کوشتارەکە گەیشتە ئەو ڕادەیەی سربستان و چیای ڕەش بەیەکەوە لەدژی هێزەکانی عوسمانی ئەو هەرێمە بوودەستن شەڕێکی فراوان ڕوویدات. ئیتر لە ئەنجامی درێژەی شەڕوشۆڕ ١٨٧٥، فراوان بوونەوەی شەڕ لە ١٨٧٦ ـ بۆ دووساڵ دواتر ١٨٧٨.. ڕوسیا کە خاوەنی کلێسەی ئەرسەدۆکسییە ڕۆژهەڵاتییەکانە لە ئاستی تێکدانی کلێسەی دیهاتەکان کە لەلایەن سەربازانی سوپای پاسەوانییەوە تێک دەدران نەیتوانی بێدەنگ بوودەستێت و بێ لایەن بمێنێتەوە ئەمە لەلایەک لەلایەکی دیکەوەش دانیشتوانی ئەم هەرێمە لەگەڵ ڕوسەکان هاو ڕەگەزن بەمانای سلاڤین ـ ئینجا لەبەر ئەمە ڕوسیا بە ناچاری خۆی خستە نێو ئاگری شەڕەکەو بەهەموو هێزییەوە لە دژی عوسمانییەکان وەستا لە ڕاستیدا مەسەلەی بۆسنەو هەرزەگۆڤینا مەسەلەیەکی تابلێی دژوارو ئاڵۆزە، لەسەر ئەمەش گەلانی ئەورووپا ململانێیەکی توندو تیژیان کەوتە نێوان و هەر ئەم مەسەلەیەش بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵە گەلێک لەیەکدی نزیک ببنەوە لەگەڵ کۆمەڵەیەکی دیکە ڕکەرکێ بکەن و یەکەمین جەنگی جیهانی لێبێتە ئەنجام و دووەمین جەنگی جیهانیش تەواو کەری بێت و ئەگەر نەڵێین ململانێیەکی توندی دیکەش سەر لەنوێ خەریکە لەسەر ئەم مەسەلەیە سەر هەڵبداتەوە، بەتاکیدیش دەڵێین ئەگەر لەو سەردەمەی ئێستا یەک جەمسەری هێز بەدەست ئەمەریکا نەبوایە، شەڕێکی دیکەی جیهانی هەڵدەگیرساو کەس ئایندەکەی نەدەزانی. ئیتر لە شوباتی ١٨٧٨ کۆنگرەی ئاشتی لە سان ستیڤان بەسترا، لیژنەی ئامادەکاری کۆنگرەی ئاشتی دانی بە ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەی بۆسنەو هەرزەگۆڤینا هێنا.بەڵام لەکۆنگرەی هێزە زلهێزەکان کە لە بەرلین بەسترا ئەم بڕیاردی هەڵوەشاندەوەو ناوچەکەی بەگشتی خستە ژێر چاودێری ئیمپراتۆریەتی نەمساو مەجەرستان.

ئەم جارە بارودۆخی بەرهەڵستکاری سیاسی گۆڕەپانی بۆسنەو هەرسەگۆڤینیا وەرچەرخانێکی سەدو هەشتا پلەیی تێکەوت کە جاران مەسیحییەکان لەدژی دەسەڵاتی موسوڵمان بەرهەڵستکاربوون، ئەمجارەموسوڵمانەکان لە دژی دۆقی نەمسای مەسیحی بوونە بەرهەڵستکار.

لەدوای بڕیاری کۆنگرەی بەرلین، خەڵکی موسوڵمان هاتنە نێو شەقامەکان و نارەزایی خۆیان نیشان دا سوپای ئیمپراتۆریەتی نەمساو مەجەرستان هاتنە نێو شارەکانی بۆسنەو هەرزەگۆڤینیا، ئینجا ئەو بارودۆخە نوێیەو ملهوری ئەڵمانیا وای ئەنجام دا کە ئەو هێزانە لە ١٨٧٨ دوە تا ١٩١٨ لەو ناوچەیە بمێننەوە.

لە دوای کپ بوونی دەنگی تەقەی بەردەکانی یەکەمی جەنگی جیهانی _١٩١٨. دەوڵەتی یۆگۆسلافیا دامەزرا. ناوچەی بۆسنەو هەرزەگۆڤینا



بووە یەکێک لە ناوچەکانی ئەم مەسیحییە نوێیە.

بەدرێژایی سالانی ۱۹۱۸ تا ۱۹۳۹ هیچ ڕۆژێک بارو دۆخی نالەباری موسوڵمانانی ئەم ناوچەیە ئارام نەبووەوە. دەتوانین بڵێین لەو ماوەیە نێوان ئەو دوو جەنگە گەورەیە سیمای ناپەینی ئیسلام لەسەرخاکی ئەم ناوچەیە تا ڕادەیەکی زۆر لاوازو بێبهێز کرایەوە.. نیتر بەهەر شێوەیەک بێت ئەمە لاپەرەکانی مێژوو ئەم گەلە تۆماریان کردووەو هەمووی بە وێنە لە ئەرشیفی نەوەتەوەی نیشتمانی گەلی موسوڵمانی بۆسنەو هەرزەگۆڤینیا هەڵگیراوە..

پێش ئەوەی زەنگی دووەمین جەنگی جیهان لێبدرێت، بارودۆخی سیاسی لەناوچەی بۆسنەو هەرزەگۆڤینیا ئالۆز بووەو تەوەرە سیاسی و میللی و مەزهەبییەکان بی جەمسەری دژ بەیەکدی بەلێکترازا بوونەوە.. ئەوەی موسوڵمان بوو مەسەلەی نەتەوەیی و جوداخوازی نەمێشکیان گەلاڵەی کردبوو! لەوهەلە دەگەڕان ئەوەی (۲۰) ساڵە خەباتیان بۆ دەکرد بەڵکو لەرێگەی ململانێی نێو دەوڵەتەیدا بۆیان بڕەخسێت دەوڵەتێکی موسوڵمان پێکبهێنن، بۆ ئەمەش خەڵکی موسوڵمانی ئەم ناوچەیە بەگشتی بە دوای پرۆپاگاندەکانی ئەڵمانیای هیتلەری کەوتن، کەوەک دەوڵەتێکی خاوەن دەسەلات و زلهێز لەناوەندی ئەوەروپا پەیدابوو. نیتر لەو تەنگژەیە حکومەتی شازادەی یوگوسلافی رووخا. هێزەکانی ئەڵمانیای نازی لە باکورەوە - کەرواتیا - دابەزین و بەرەو باشوور - ناوچەی بۆسنەو هەرزەگۆڤینا بوونەوەو نیوەی هەرێمی بولقانیان داگیر کرد موسوڵمانەکان پشتگیری هێزی داگیرکەریان کردی ئەو پشتگیری کردنەی مسوڵمانەکان بۆ هێزی داگیر کەر، تەنیا مەبەستێکی تاکتیکی سیاسی بووە تا لە جەور و ستەمی حکومەتی شازادەی بەلگراد رزگاربن، لە هەمان کاتیشدا نابێت ئەوەمان لەیاد بچێتەوە کە ئەڵمانیا لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا هاو پەیمانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی موسوڵمان بووەو لە هەمان کاتیشدا ململانی نێوان ئەڵمانی - روسیا جگەلەوەی ململانێیەکی ئایدیۆلۆژییە دیسان ململانێیەکی مەزهەبیشە. بۆ ئەمە خەڵکی موسوڵمانی بۆسنەو هەرزەگۆڤینا پێویستە ئەم هەلە بقۆزنەوەو سوود لەم ململانێیە نێو دەوڵەتییە وەربگرن.

بۆ مەسەلەی ئەم پشتگیرییەش لە مێژوودا نموونە زۆرن ، لەمانە پێشوازی کردنی هێزەکانی ناپلیۆن کە ولاتانی ئەوروپای داگیر دەکرد.. کە ئەڵمانیا هێرشی بۆ گارستان و رۆمانیا هێنا ۱۹٤۱ - سوپای هەردوو دەوڵەت شەریان نەکرد یەکسەر خۆیان خستە پال هێزەکانی ئەڵمانیای نازی - شالاوی هاوپەیمانان لەباشووری عێراق - ۱۹۹۱. خەڵکە بە گشتی پێشوازییان لێکردن. شالاوی هێزی پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی لەکوردستانی عێراق - ۱۹۹۱ - خەڵکی کوردستان بەگشتی پێشوازییان لێکردن. ئیتر بەم شێوەیە موسوڵمانەکانی ئەم هەرێمە پێشوازییان لەهێزەکانی ئەڵمانیا کردو یارمەتیشیان دان.

هێزەکانی ئەڵمانیا هێشتا بارو بنکەیان لەخاکی ئەم ولاتە نەخستبوو کەمسوڵمانەکان هێزێکیان بەناوی - ئۆستاشی - پێکهێناو لەژێر چاودێری ئەفسەرەکانی نازی دەستیان بەسەر کاروباری هەرێمەکە گرت و تەواوی نیوەی خاکی بولقانیان کۆنترۆڵ کرد. هەروا حکومەتێکیشیان بەناوی حکومەتی ئۆستاسی دامەزراند .. نیتر ئەوەی بیست ساڵ بوو زۆر و ستەمیان لێکرابوو تۆڵەی هەموویان کردەوە بەڵکو پتریش. لە هەموو شوێنێ مزگەوتە تێکدراوەکان کە کلیسەی لێدروست کرابوو، سەر لە نوێ تێکیان دایەوەو مزگەوتیان لێدروست کردەوە.. هەندێک سەرچاوە دەڵێن لە ماوەی ئەو بیست ساڵەی پێشوودا لەوناوچەیە ۱۱۱۲ مزگەوت تێکدراوە بەلام لەسەرچاوەی دیکەش دەڵێت بۆسنەییەکان لە ژێر چاودێری هێزەکانی نازی هەموو مزگەوتەکانیان دروست کردەوە کە ٦٥٢ مزگەوت دەبوو - لێرەدا ئەم هەڵەیە لە ژمارەکەدا هاتووە.

لەوناوچانەدا تەواوی ناوچە مەسیحییەکانی دیکەی بولقان دا، بەسەرۆکایەتی تیتو - بزووتنەوەی نیشتمانی لەدژی ئەڵمانیای نازی داگیر کەرو حکومەتی - ئۆستاش - دەستیان بە خەباتی چەکداری کردو لە ناوچە شاخاوییەکانی هەرێمی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا بۆ ماوەی سێ ساڵ و نیو شەرو پێکدادان لەو پەری گەرمیدا بوو.

لەسەرەتای ساڵی ۱۹٤٥ هێزێکی سوپای دووەمی یۆگسلافی سەر بە رێکخراوی بزوو نەوەی رزگاریخوازی میللی لە هێرشێکی فراوانی توندا



توانی زۆربەی شارەکانی وەک موستار، سەرایێڤۆ، بانیالوکا ڕزگار بکات وهێزە بەکرێگیراوەکەی ئۆستاش ـ یش تێکوپێک بشکێنێتەوە. بەم شێوەیە هێزی بەرەی ئازادیخوازان بە سەرۆکایەتی ڕابەرێکی ڕێکخراوی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللی توانیان لە سەرانسەری یۆگسلافیادا خۆیان بچەسپێنن و بیرو بۆچوونی جوودا خوازە موسڵمانەکان تێک بشکێننەوە و لە ٢٨ / نیسانی / ١٩٤٥ دا یەکەمین حکومەتی میللی لە بۆسنەو هەرسەگۆڤینا لە چواچێوەی یۆگسلافیای فیدراڵدا پێکبهێنن.ئەمەیش لە دەستووری ڕاستکراوەی کۆماری یۆگسلافیا دانی پیانراوە.

کەواتە ئەو دەڤەرە لەماوەی کەمتر لە ٢٦ ساڵ ١٩١٩ ـ ١٩٤٥ سێ جۆرە ڕژێمی بەسەردا سەپێنرا... ئەم دەڤەرەدەمێک لە ژێر دەسەڵاتی کەرواتیەکاندا بوو، دەمێک بووە پارچەیەک لە خاکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، دەمێک کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئەمساو مەجەر، دەمێک شازادەی بەلگراد ڕژێمی دەرەبەگایەتی مەسیحی بەسەردا سەپاندن. دەمێکیش بوونەخاوەن دەوڵەت ـ ئۆستاشی ـ و ئینجا ئەمجارە کەوتنە ژێر کاریگەری ژەنەراڵ تیتۆ و فەلسەفەی مارکیسزم. بەڵام لەدوای ڕووخانی حکومەتی ـ ئۆستاشی ـ هێزەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللی بەهیچ شێوەیەک نەیانهێشت لەلایەن مەسیحییەکان هیچ دەست درێژییەک بۆسەر موسوڵمانەکان بکرێت.. بەڵام ئایا ئەو کاتەی هێزەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللی شارەکانیان داگیردەکرد هیچ نێرینەیەکی موسڵمانیان دەبینی؟! نەخێر!! چونکە هەموویان بە گشتی ئەوەی نێرینەبوو و لەتەمەنی دەساڵان گەورەتر بوو لەگەڵ هێزەکانی ئەڵمانیای نازی بەرەو باکوور هەڵکشانولەوێوەش بۆ ئەڵمانیاو ئیستەو ئیستاش نەگەڕاونەتەوە.. هەندێ سەرچاوە دەڵێن هێزەکانی ئۆستاشی نزیکەی ١١٠ هەزار چەکدار دەبوون، بەڵام کاتێک کەهێزەکانیان تێک شکێنرا بەوە ژمارەی موسڵمانە ڕەوکەرەکان بە چەکدارو ژن و جحێڵ و مێرد منداڵ و منداڵە ساواکانەوە نزیکەی نیو ملیۆن موسوڵمان دەبوون. ئەو نیو ملیۆن موسوڵمانە ئیستاش دەنگوباسیان نییە. ئەوەی لەو ڕێگە دوور درێژە لەبرسان مردو، ئەوی دیکە بەنەخۆشی مردن و ئەو پیاوە چەکدارانەی مانەوەش لە کۆتایی ڕۆژەکانی بەرگری ئەڵمانیەکان، لە ژێر کاریگەری ئەوڕژمی مووشەکە نوێیەکانی کاتیۆشای ڕوسی ئەوانیش کوژران و یەکێیان ڕزگار نەبوو... ئیتر کە ڕژێمی نوێی تیتۆ لەو هەرێمە دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت موسڵمانەکان تەنیا ئافرەتیان مابوو ئینجا یاسای ـ ژنهێنانی مەدەنی ـ دەرچوو مەسیحییەکان ئافرەتت موسوڵمانەکانیان دەخواست و ئێش و ئازارو موعاناتی ئەم میللەتە هەژارو بێ دەستەڵاتە لێرەوە دەستی پێکردو، جەوسانەوەی ئەمجارەیان لە هەموو سەردەمەکانی پێشوو جەرگ بڕ تربوو.

پێشتر گوتمان لە سەردەمی عوسمانیەکان، بزووتنەوەی سیاسی بەگشتی بەدەست مەسیحییەکانەوە بوو، بۆیە لەکاتی سەردانی ئیمپراتۆری ئەمساو مەجەڕستان ـ فرانز فریدیناند Archuke Franz Fredinand کە لەگەڵ شازادە سۆفی شوتیک ـ Countess Sophie Choten ـ ی خێزانیدا سەردانی سەراجیڤۆی پایتەختی بۆسنەو هەرسەگۆڤینایان کرد لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩١٤. لە لایەن ڕکخراوێکی سریە مەسیحییە بۆسنەییەکان، کە ناوی Gavrilo Princip بوو کوژرا. کوشتنی فرانزفردینادی ئەرشیدۆکی ئەمساو مەجەڕستان لە پایتەختی ئەو هەرێمە مەشخەڵی ئاگری یەکەمین جەنگی جیهانی هەڵکردو هێزەکانی دنیا بوونە دوو بەرەو لەدوو سەنگەری بەرانبەر یەکدیدا پتر لە دە ملیۆن کەس سەری تێچوو.. ئەمە جگە لەوەی کە لە ساڵی ١٨٧٧ یش هەر لەسەر مەسەلەی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا شەڕێکی گەورە لەنێوان بەرەی ڕوسیاو سربیا وبەرەی ئەمسا و مەجەڕستان و عوسمانییەکانەوە هەڵگیرسا. ئەگەر بێتو بەوردی سەیری ئەخشەی ئەوروپای پێش ساڵی ١٨٧٧ بکەین بۆمان بەدیار دەکەوێت کەگشت یارمەتی یە ئەمساوییەکان بۆ خەڵکی موسڵمانی بۆسنە هەرسەگۆڤینا تەنیا لەبەر ئەوە بووە کە ئیمپراتۆرییەتی ئەمسا و مەجەڕستان جێشوێن پێیەکی لەسەر دەریای ئەدریاتیکدا هەبێت کە تێکەڵاوی دەریای سپی ناوەڕاست دەبێتەوەو لەوێوەش دەتوانێت هەڕەشە لەئۆکەندی سوێسی ئینگلیزی بکات و ڕێگەی بازرگانی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی دوور لێداگیر بکات... (سەیر بکەن



مەسەلەی شالاوی ناپلیۆنیش بۆ سەر میسر لە پێناوی ئەم مەسەلەوە بووە).
ئەمە هۆیەکی سەرەکی بووەو جگە لە هۆیەکی دیکەی حەشاردراوە لەململانێی هەردووکلیسەی رۆژهەلات و رۆژئاوا خۆی دەنواند (روسیا تا ئێستاش خاوەن دەسەلاتی کلیسەی رۆژهەلاتە) بۆ ئەم مەبەستەیش ئەمساوییەکان بەدرێژایی سالانی نێوان ۱۸۷۷ تا ۱۹۱۸ بە زەبری ئاگرو ئاسن لەو ناوچانە مانەوە.

دوای (۲۰) سالی کشانەوەی هێزەکانی ئەمساو مەجەرستان و دامەزراندی دەولەتی یوگسلافیا لە سالی ۱۹۱۸. جارێکی دیکەش هێزەکانی ئەمسای بە هاریکاری ئەلمانییە نازییەکان لەسالی ۱۹٤۱ بەیەک ملیۆن و نیو سەرباز پەلاماری ناوچەکانی سلۆڤینیا و کەرواتیا و بۆسنە و هەرسەگۆڤینیایان داو هەرێمی بەلقانیا بەتەواوەتی داگیر کردو تەواوی قەراغی رۆژهەلاتی (بە گوێرەی خاکەوە دەکاتە قەراغی رۆژئاوای بەلقان) دەریای ئەدریاتیکیان داگیر کردودیسان بۆ جاری دووەم لەمێژوودا هێزەکانی ئینگلیزو فەرەنسایان لەسەر خاکی هەرێمی بەلقاندا بەزاندو هەرەشەیان لە قوولایی دەریای سپی ناوەراست کردو هەر ئینگلیزەکانیان لە دوورگەی کریت بەزاندو دوورگەکەیان داگیرکرد بەمەش لە نۆکەندی سوێس نزیک کەوتنەوەو دنیایان سەر لە نوێ خستە نێو لەپی عفریتەوەو ئاگری دووەمین جەنگی جیهانیان خۆش کردەوە.

لەمایسی / ۱۹٤٥ کە دەنگی دوا ترین تەقە لەبەرەکانی نێو گۆرەپانی ئەورووپا برا وبۆ جاری سێیەمین دەستوێی ئەمساو ئەلمانیایان بەستەوەو دەولەتانی هاوپەیمان ئەیانهێشت ئەو ئارەزووە کۆن و نوێیەی ئەمسەوی و ئەلمانییەکان لەو ناوچەیە بێتە دی. ئەگەرچی پێشتریش لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانی - تۆبە - بە تورک کرا کە چیدیکە دەست بۆ دواوەی (مەبەست رۆژئاوایە) بەرەکانی هەرێمی بەلقان درێژ نەکاتەوەو لەو هەرێمە هەرەشە لە بەرەکانی هێزی رۆژئاوا نەکات، ئێستا دوای یەکگرتنەوەی ئەلمانیا لە کانونی یەکەمی ۱۹۹ ، هەروگیف و تۆقاندن و کوشتن و سووتاندنی خەلکە ناوارەیە بیانییەکانی ئەلمانیا بزووتنەوەی هەندێک رێکخراوی نوێی نازی لە ئەلمانیا، ئەم ولاتە سەر لە نوێ دەسەوێت ببێتەوە هێزێکی کاریگەری نێو دەولەتی و نیازی وایە رۆلێکی کاریگەر لە بواری سیاسی نێو دەولەتید بگێرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نیازی وایە لە ئەنجومەنی ئاسایش لەتەک ئەو پێنج دەولەتەی ئێستا ئەمریکا - فەرەنسا - بەریتانیا - روسیا - چین، ببێتە ئەندامی هەمیشەیی. لەم بارەیەوەش یارمەتی دەیان دەولەت دەدات بۆ ئەوەی رۆژێک لە رۆژان، کاتێک کە خۆی بۆ ئەم مەبەستە هەلدەبژێرێت هیچ دەولەتێک لاری نەبێت و پشتگیری تەواوی لێبکەن.

بەلام ئەلمانیا پێش ئەوەی هەنگاو بۆ ئەم مەبەستە هەلێنێت، لە گۆرەپانی بۆسنەو هەرسەگۆڤینادا ئەزموویێکی تال و دژواری وەرگرتووە. کە شکستی هێزەکانی ئەلمانیای نازی لەم دەڤەرە - بولقان - یەکێک بووە لە هۆیە گرنگەکانی رووخانی رایخی سێیەم (ئەلمانیای ۱۹۳۳-۱۹٤٥). هەرێمی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا ناوچەیەکی زیندەگی فراوانبوونەوەی دەسەلاتی ئەلمانیا بووە. هەروا ئەم بارودۆخەی ئێستامان بارودۆخەکەی سالی ۱۸۸۷ـدا هەمیشە هەمان مەسەلەکەی ۱۹۱٤ـدیە کە فەردیناندی دۆقی ئەمسای تێدا کوژرا و هەروا هەمان بۆسنەو هەرسەگۆڤینای زسنانی سالی ۱۹٤٤ـدا کە هێزەکانی ئەمساو ئەلمانیا تووشی گەورەترین بەزینی سەربازی بوونەوە لە مێژووی دووەمین جەنگی جیهانیدا.

ئینجا ئەگەر دەولەتە زلهێزەکانی وەک روسیا و فەرەنساو بەریتانیا و دەولەتانی دیکەی وەک سربستان بە درێژایی مێژووی نوێ نەیاهێشتبێت ئەمسەوی و ئەلمانییەکان جێ شوێن پێیان لە ئاوە فێنکەکان (دەریای سپی ناوەراست) دا بکەنەوە کە کەشتی گەلی ژێراوەکانییان (الغواصات) لە کەنارەکانی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا و کەرواتدا (دەریای ئەدریاتیک) مەنزلگایان هەبێت هەرگیز ئێستا کە ئەمەریکا وەک شێر لە سەرانسەری دنیا بووەتە تاک جەمسەر، ناهێلن ئەلمانیا لەم پشتگیرییەی ئێستا هاریکاری موسلمانانی ئەم دەڤەرە بکاتەوە و ناشهێلن ئەلمانیا لە ناوچەی بەلقاندا هیچ سەنگییەکی نە سیاسی و نە سەربازی هەبێت...

ئەمانە بەگشتی لە رووی مێژووی سەربازیدا بووە کە بتوانین بە چاوی رەخنەیی ویژدانەوە سەیری مەسەلەکە



بکەین، بەلام لە رووی سیاسییەوە دەولەتانی گەورەی وەک روسیا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمەریکا کە ئەم چوار دەولەتە بە یەکەوە جلەوی ملهوری ئەلمانیان گرت و بریاری خۆ بە دەستەوە دانی بێ کۆت و مەرجیان لێ کرد هەلبەتە نایانەویت بۆ جاری پێنجەم مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوەو ناشهێلن دست پێشخەری ئەلمانیا بە دانپینانانی بە هەر سێ کۆماری سلۆڤینیا و کەرواتیا و بۆسنەو هەرسەگۆڤینا هیچ مایەیەکی هەبێت و هەروا ناهێلن ئەلمانیا هیچ یارمەتییەکی موسلمانەکان بدات و لێی دووره پەرێز بینەوه ئەمە وەک هەنگاوەکانی هیتلەری لێبێت کە سالی ۱۹۳۹ ناوچەی (سوات)ی چیکی داگیر کرد لە دواییدا کە دەولەتە زلهیزەکان بەریەچدانەوەیان نەبوو خاکی ولاتی چیکی بە گشتی رامالی سەرکردەکانی وەک ستالین، تشرشل، دالادییە و رۆزفلت لە ئاستیدا تا ماوەیەک دەمی خۆیان داخست، چونکە هێشتا نیازی هیتلەریان بۆ ئاشکرا نەبووەوە، بەلام ئێستا نیازی ئەلمانیا لەم دەستپێشخەرییە روون و ئاشکرایە، ئەمە لە لایەک لە لایەکی دیکەوە ئێستا کە هێزی دنیا یەک جەمسەرە، وەک سالانی پێشتر نییە کە بەریتانیاو فەرەنسا لە ژێردەوە وا رێککەوتبوون کە خۆیان لە داگیرکردنی چیکدا بێدەنگ بکەن، بەلکو هیتلەر بە گژ ستالیندا دەچێت لێیان دەبێتە شەری گەورە ئینجا بە دەستی خۆیان نا بە دەستی یەکێکی دیکە هەرەشەکانی ستالینی شیوعی دەرووخێت.

لە هەمان کاتیشدا لەو مەسەلەیە ئەمەریکا بە توندی هاتە پێشەوە لە گۆرەپانەکە نەیهێشت یەکێتی ئەورووپا هیچ رۆلێکی هەبێت و هیچ چارەسەرییەکی سەربگرێت، ئیتر بە خۆی بە (٦٠) هەزار سەرباز لە ژێر چاودێری (UN) دەستی هەموو دەستێوەردانێکی بری ئەگەرچی موسلمانەکانیش تێیدا نەیاتوانی دەولەتی ئیسلامی دروست بکەن. ئەمەش دا ئەزموونی سالی ۱۹۳۹ ی پۆلۆنیا لەبەر چاوە، کە ئەمەریکا نایەوێت لە ژێرەوە هیچ سیاسەتێک بەرێوەبچێت.

سەر ژمێرییە رەسمییەکانی ئەم دەڤەرە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی سالی ۱۹۷۱ : ۳.۷٤٦.۱۱۱ کەس بووە. موسلمانەکان ۳۸٪ ی دانیشتوانی ئەم ناوچەیەیان پێکهێناوە، سرپیەکان ۳۳٪ن، کەرواتییەکان ۱۷٪ن، چیای رەش و ئەلبانیەکانیش ٥.٥٪ن ، لەم رێژەیەوە دیار دەکەوێت کە ٦٢٪ ی دانیشتوانی ناوچەی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا مەسیحین و موسلمانەکان تێیدا کەمینەن.

بۆیە دروست کردنی دەولەت لە لایەن کەمینەیەک لە هەندێک سەردەمی دەسەلاتیدا لێدانی کوشندەی بۆ مەسیحییەکان کردبێت لە سەردەمی لاوازی و بێ هێزیشیدا نیوو ملیۆن ژن و زەلام و مندالی لێ گوم دەبێت. ئەم مەسەلە زۆر ئالۆزە ئەگەر هەرێکەوت تاکە جەمسەری هێز ئەمەریکا لەو سەردەمە ناسکەدا لە کۆرێ نەبا، بێ گومان جەنگێکی دیکەی جیهانی هەلدەگیرساو کەس ناینەدەی نەدەزانی.

بەهەر حال لەو باوەرەشدا این حکومەتی ئێستەی سەراییڤۆ دەسەلاتی لەسەر هیچ ناوچەیەکی بۆسنەو هەرسەگۆڤینادا نابێت کە ئایینی ئیسلام وەک فەلسەفەی دەولەت پەیرەو بکات.

لە کۆتاییدا نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێتەوە کە ئەمەریکا لە کاتی تەقینەوەی تەنگژەی بۆسنەو هەرسەگۆڤینا رۆلێکی گەورەی ناشتی لە دەڤەرەکەدا گێرا، هەر زوو دەوری مەسەلەکەی گرت و ئابلوقەی ناردنە چەکی بەسەر هەرێمەکە سەپاند. بە کەشتی گەلی خۆی پاسەوانی قەراغەکانی ئەو ناوچەیەی کرد. نەیهێشت هیچ دەولەتێک دەست لە شەری ناوچەکە وەربدات ئەگەر هەندێک دەولەتی ئیسلامی بیهێز نەبێت لەبەر بەرژەوەندی بازرگانی خۆی لەگەل ئەلمانیا چەند پارچە چەک و تەقەمەنی سووکیان بۆ رەوانە بکات، لەمەش ئەمەریکا هوشیار بوودودو بە توندی سەرزەنشتی کردن و هەرەشەی لێکردن . ئیتر بە خۆی بە (۲۰) هەزار سەربازی ئەمەریکی و (٤٠) هەزار سەربازی ولاتانی دیکە بە بریاری ئەنجومەنی ئاسایش خۆی لە دەڤەرەکە سەپاندو کێشەکەی براندەوە... لەمەشدا ناتوانین بلێین ئەمە کۆتایی مێژووی دەڤەری بولقانە.





# ئایا بۆمبی ئەتۆمی ئیسلامی هاتە کایەوە؟!!

***نوسینی تەلعەت جەلال***

زەمانێکە لە هەندێ نێوەندە سیاسیەکانی ئیسلامەتیدا بیرۆکەیەک بڵاوبووەتەوە ئەویش بە دروست کردنی بۆمبی ئەتۆمی ئیسلامی دژی ئەو بۆمبە ئەتۆمیانەی کە دەوڵەتە دژ بە ئیسلامیەکان هەیانە بە تایبەتی ئیسرائیل، کە پێویستە پارسەنگێک لە نێوان هەر دوو (هێزی ئیسلامی و ئیسرائیلی)دا دروست بکرێت بەمەبەستی گەڕانەوەی شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام.

ئەوە بوو تاقی کردنەوەی بۆمبی ئەتۆمی پاکستانی بیرۆکەکەی چەسپاند لە هەندێ نێوەندە ئیسلامیەکان وە لە زۆر دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جۆراو جۆری وڵاتە ئیسلامیەکان بە شادیەوە باسی ئەو تاقی کردنەوەیان دەکردو بۆمبی ئەتۆمی پاکستانی ناوبرا بە بۆمبی ئیسلامی...



بەڵام لێرەدا پرسیارێک خۆی فەرز دەکات کە ئەویش ئەوەیە ئایا ڕاستە بۆمبی ئەتۆمی پاکستانی... ئیسلامیە؟...؟ یا باشتر بڵێین موڵکی ئیسلامەو لە پێناو ئیسلام و هەڕەشەکردن لە ئایینی ئیسلام بەکاردەهێنرێ؟ وە بۆچی ئەم بۆمبە ناونرا بە بۆمبی ئیسلام ؟

بەلای منەوە لێرەدا (سێ لا) هەن کە ئەم ناویان لەم بۆمبە ناوە لە پێناو بەرژەوەندیەکی تایبەتی خۆیان:

**یەکەم /** دوژمنانی ئیسلام کە پروپاگەندە بۆ بوونی ئەتۆمی ئیسلام و ناونانی بۆمبی پاکستانی بە بۆمبی ئیسلام کەبۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆیانە ئەویش تا بۆ ڕای گشتی جیهان بیسەلمێنن کەوا ئیسلام هەڕەشە لە بوونی وان دەکات ئەوەتا بۆمبێکی ئەتۆمی هەیەو... کێ نالێ لە کاتێکی نزیکدا ئەم بۆمبە ناکەوێتە دەستی ئەو ئیسلامە توندرەوەکانەوە کە هەڕەشە لە ئاشتی دەکەن. ئەمەش بە مەبەستی دژایەتی کردنی ئیسلام لە جیهانی ئیسلامیدا.

**دووەم/** پاکستان خۆی پروپاگەندە بۆ بۆمبی ئیسلام دەکات چونکە دەزانێ کە تەنها تاقی کردنەوەکانی ئەتۆمی هەر چەندە پاش تاقی کردنەوەکانی هیندستان هات بەڵام وڵاتە زلهێزەکان ڕازی نابن، و خۆشی وڵاتێکی هەژارو کەم دەرامەتە و توانای ئابووری زۆر کەمە پێویستی بە یارمەتی دەرەوە هەیە بۆ بژێوی هاووڵاتیانی وە تاقی کردنەوەکانی هەڕەشەیەکی بۆ خۆی پەیدا کرد بە ئابڵوقەدانی ئابووری لە وڵاتە زلهێزەکان هەر لەبەر ئەمە پێویستی بە قەرەبۆیەک هەیە کە لە لایەن وڵاتە ئیسلامیەکانەوە بێت و یارمەتییان لێ وەربگرێت بە



تایبەتی لە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی کەنداو.

**سێیەم/** هەندێ لەنێوەندە ئیسلامیەکان کە خۆیان دەیانەوێ ببنە هێزێکی ئەتۆمی، بەڵام ناتوانن لەبەر چەند هۆیەکی دەرەکی و ناوەوەی خۆیان، بەڵام ئەمەی کە پاکستان کردی جۆرە تەعویزێکە بۆ ئەو نەتوانینەی خۆیان هەر لەبەر ئەمە هەموو توانای ڕاگەیاندنی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی بۆمبەکە ناوبنرێت (بۆمبی ئیسلامی) کەوا دەزانن خۆیان بۆمبی ئەتۆمیان هەیە. بەڵام ئایا ڕاستی بۆمبە ئەتۆمیەکەی پاکستان بۆمبی ئیسلامییە؟ لە وەڵامدا دەڵێین:

...هیچ بۆمبێک ناسنامەی نییە.. بۆمب نییە ڕەگەزی هەبێ یا ئایینی هەبێ بۆمب دروست دەکرێت هەر جۆرێک بێت بۆ ئەوەی زیان لە مرۆڤ بدات بۆ تێکدان و ماڵکاولکاری، لێرەدا بە جۆرێکی تر پرسیارەکە دەکەین: ئایا هی بۆمبێک، ئەتۆمی بێت یا بۆمبێکی تەقلیدی...، ئەگەر هات و لە شوێنێک تەقیەوە دەپرسێ من بۆمبی فلان ئایینم وە ئەوەی لە ئایینی من دابێت من نایانکوژم.... یا دەپرسێ من فلان ڕەگەزم ئەوەی لە ڕەگەزەکەی من بێ ناکوژرێن. یا هەموو کەسێک لە چ ئاینێک یا ڕەگەزێک، بێ جیاوازی دەمرێت و نامێنێت؟

وا بزانم ئەمە سادەترین زانیارییە لای مرۆڤ کە لە کاتی تەقینەوەدا هیچ بۆمبێک کەس نابارێزێت.. ئەمە لەلایەک وە لەلایەکی تردا ئایا بەیانی ئەگەر هات و پاکستان لەگەڵ وڵاتێکی ئیسلامی جەنگاو توشی شکست بوو و مەترسی نەمانی لە خۆی بینی بۆمبە ئەتۆمیەکەی بەکارناهێنێت بۆ ئازاردانی وڵاتە ئیسلامی یەکە!!؟ یا بۆمبەکە دێتە دوان و دەڵێ: من بۆمبێکی ئیسلامیم و نابێت بەکارم بێنن بۆ وڵاتێکی ئیسلامی.. ئەمە خەونێکە چونکە نە بۆمبەکە دێتە دوان و نە پاکستان ئەو کات بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەو وڵاتەی بەرامبەری دەجەنگێ وڵاتێکی ئیسلامی یەو بەڵکو لای ئەو ئەوکات وەک وڵاتێکی هەرەدوژمن دەبێت... ئەمە لایەنێک بوو بەڵام لایەنەکەی تر ئایا تاقی کردنەوەکەی پاکستان بە مەبەستی تاقی کردنەوەیەکی بۆمبی ئەتۆمی پاکستانی بوو کە دژی تاقی کردنەوەکانی هیندستان بوو یا تاقی کردنەوەی بۆمبی ئەتۆمی ئیسلامی بوو؟ وابزانم هەموو چاودێرێک لێرەدا بەراشکاوی دەڵێن بۆمبی ئەتۆمی پاکستانی نییەو بەهیچ جۆرێک پەیوەندی بە ئیسلامەوە نیە؟ بەڵکو تەنها تاقی کردنەوەکان مەبەستی تەوازنێک لە نێوان خۆی و هیندستان دروست بکات پاش تاقی کردنەوەی ئەتۆمی یەکانی هیندستان کە هێرشێکی مەترسی بوو لەسەر ئاسایشی نەتەوەی پاکستان و دەبوایە وەڵامی بداتەوە بە ئەنجامدانی تاقی کردنەوەکانی ئەتۆمی خۆی تا بتوانێ تەوازنەکە هەرچەندە پێی دەڵێن (تەوازنی مەترسی) (توازن الرعب) بەڵام هەبوونی ئاسایشی نەتەوەیی پاکستان لەمەترسی یەکی یەکجار گەورە ڕزگار دەکات.

لێرەدا وا بە ڕاشکاوی بۆمان دەردەکەوێت کە (بۆمبی ئەتۆمی ئیسلامی) نی یەو تەنها سەرابێکە و زیاتر نا... بەڵکو ناو زەدکردنی بەوناوە تەنهاو تەنها وروژاندنی دەوڵەتانی ئیسلامە، کە بیرای ئیسلام لە ئاشتی زیاتر بیری لە جەنگی بۆمبی ئەتۆمی و تەقەمەنی و کوشتار نەکردۆتەوە. بەڵکو دەیەوێ تێکڕای کێشەکان لە ڕێگای (ئاشتی) یەوە چارەسەر بکرێن ئەوەیە بەرنامەی حەقیقەتی ئیسلامی ڕاستەقینە.





# عەرشی ئەعزەم

تاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی

بابەناوی خوا بکەم پیرۆزی گەفەکۆیەکەم

هەم سەلات و هەم سەلامی بێ ژمارەیش لێ بدەم

سەر محمد خۆشەویستی چاترینی مرسلین

ئال و ئەیحابیش لەگەڵ بن تا قیامەت تابعین

ئێمە لەو کۆڕە کە گردبوین خەڵکی هەولێر دەوروبەر

تاریکی رۆیی لەناومان مانگی چواردە کەوتە دەر

زۆر لە مێژە کەلەشێری عەرشی ئەعزەم خەوتوە

ناری بابەیێ فەقێیان رۆژو ئەو ئەی بیستوە

وەی دەنا بمدیتبا دەرسی بوخاری خیندبا

چەند قوتابی ژیرو زیرەک وێنەیان نەتبیستبا

کانی مزگەوت کانی تەکیە خانەقاو حوجرەکان

بونە تۆزو خۆڵی رێگا خۆنەمان تێکرا رمان

کەوتە بن خۆڵی بە شۆفەر قاضیا تەفسیرەکەت

حاشیانی شێخ و تەمجیر (پێغە اللّٰه)ی کوردەکەت

بابگریێ سەعدی گەورە لۆ مگول مختێر

جامی و جمع الجوامع حاشیبیەی ر.ن لەگەر

دەستەیێ بۆ بکری رەنگین پیرغابی هەرشەمی

وەک ئەفەندی ئەربیلی خاوەن وجوح ..سیر رۆستەمی

داخی گەورەم ماوە لۆ تحفەو کەمالی پڕ کەمال

خۆزگە مانە ئەوانە با بچوبا کتوکاڵ

ئەی دڵاتاکەی دەنالی وا بەهار نوبویتەوە

داروباری وشکی کوردان سەر لەنو شین بوینەوە

هیمەتی بازوی دلێرات نو دەکاتن مەفتەنی

خانی و کۆشک و قەرات و باخ باخچەی دانی

هەر لە پشدەر تا قەراجی باڵەکان خۆشناوەتی

لای بەرانیان دەشتی هەولێر لای خودایێ یارمەتی

ماوەران و بالیسان و هەرتەل و پێنجوین لەگەر

وەک شەوەک هەرشەم بەحرکە تاختەوجەل ئاغ جەلەر

رۆستەو گرتگ زیارەت هەو رەواندز و گراو

ئاکرەو ئامێدی مانی وەک بریفکان و گناو

بێ چریکەی بولبولان بۆی سونبولان هاشەی روبار

لێ بخێن لێ سەماع کەن لێ بنوسن سەد هەزار

مۆژدە بێ ئەو ساڵ ئیجازە سەر لەنو دەست پێ کرا

شارەزور بەغداو هەولێر چادری غەم لادرا

وێنەیی وانە ئوێدم رۆژ بەرۆژ هەر زێدەکەن

بۆ دیفاعی دینی پاکی مێکفر سستی نەکەن

بۆ ئەوانە لائقە خۆ سەد هەزاران ئافەرین

جوببەکەی سەرشان و ملیان بێ نیشانە و ئەوگر دین

تا قیامەت هەردەمێنێ تاقمەی حەق بێ خەتەر

چاودێرانە خواوەند ئایینن قەنعا زەرەر

گاهر گەر دەتهەوێتن تۆ لە دۆزەخ بی قوتار

بەردەوام بە لۆ قوتابی ئاینی خزمەت گوزار



## گوناهبارم

سەید بورهان پاکی

یا رەسولەڵڵا بە قوربان قەت کارێ چاکم نیە
هەر خەریکی ژینی شادم قەت بیری خاکم نیە
هەر لەپێم تا تەوقی سەرم، کەوتمە داوی زەمان
وا لە ئاستی راستی کوێرم، بۆ گوناە تاکم نیە
بەدەست و دەم ڕوو لەخراپەم وەک یەکێ هەردەم نەزان
باوەڕی وابێ، دوا ڕۆژ قەت پرس و حاکم نیە
ئێش و زامم پڕ لە دڵدا زۆر گرفتارم گەلێک
تێم دەگەن گەر سەیری دڵ کەن چارەی ڕوحاکم نیە
هەر هیوای باخەڵ پڕیمە خواردنی خۆش و چەور
بۆیە قەت بیری هەژارو دیل و خەمناکم نیە
هۆش و بیرو گشت خەیاڵم کردەوەی ناڕێکەهەر
بۆیە نەنوارم لە خۆما هیچ بەشێ، باکم نیە
ماڵ وێرانم زۆر نەزانم وا لە قاپیت مل کەچم
ڕوو ڕەشم بە خوداو بە قورئان هۆش و ئیدراکم نیە
بەس هە: تاکو گیانی (پاکی) ماوە بێ ترسەو دەڵێ
چیم لە گەرمی دۆزەخ دایە، پشت بە تۆ باکم نیە

## خۆری ئیسلام

شیعری : ئیسماعیل هێدی

دوور لە بەرنامەی پیرۆزی خوایی
قەت ناگەی بە هیچ؛ تەنیا ڕیسوایی
خەرمانی ڕەنجت بەدەم با دەچێت؛...
ڕووی حەز بکەیتە دەرگای دنیایی

* * *

گەلێک زۆر هاتن لەم سەر بۆ ئەو سەر
بۆ ساتێک ژینی وا کورت و بێ بەر
زۆریان دا بە کەم؛ کەمیش چوولەدەست
دوایی بەرەو کوێ، ڕێیان گرتەبەر؟!

* * *

بادەی ؛ سەرمەستیت؛ دەڕژێ لە دەستی
دنیاکێی کردووە، بە خزم و دۆستی؟!
ئەوەی هات ڕۆیی کاروان سەرایە
هەرساتە؛ یەکێک؛ دەکەوێت کۆستی

* * *

تا حەزو داوای پیسی نەفسی خۆت
نەخەیتە لاوە، لە ژێر داو و کۆت
بەخت و سەعادەت چۆن بەدەست دێنێ؟
گەر (خۆری ئیسلام) ، هەڵنەیەت لە بۆت؟!



## چیرۆکی فۆلکلۆری

# ئەو کەسەی میوانی خۆش بوێت خۆشەویستی خوایە

ئامادەکردنی: ئەیوب کوردی

هەبوو نەبوو کەس لەخوا گەورەتر نەبوو پیاوێکی موسڵمان خاوەن خێزان بوو ئەندامانی خێزانەکەی ئەمانە بوون، ژنەکەی و دوو کوڕی ١٠و١٢ ساڵان و کچێکی مێرد کردووی لەگوندێکی دوور لەگوندەکەی خۆیان. ماڵی دنیاو سەروەت و سامانیش ئەمانەی هەبوو، مانگایەك و بەرخێك و کەلەشێرێك، پیشەی خۆی کرێکاری رۆژانە بوو، ماوەیەك بەبێ کاسبی لەماڵدابوو بەڵام باوەڕی بەخوای مەزن رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبوو، دوای نیوەڕۆی رۆژێك میوانێکی نورانی لەدەرگای ماڵیانی‌داو بەمیوانیان زۆر بەخۆشحاڵی پێشوازیان لێ کرد، پیاوەکە بۆ دروست کردنی نانی ئێوارە بەژنەکەی ووت ئافرەت چیمان هەیە؟. ژنەکەی لەوەڵامدا وتی هیچ.. پیاوەکە ووتی با کەلەشێرەکە سەربڕین خو میوانی وا هەموو رۆژێ روو لەئێمە ناکا. ژنەکەی ووتی باشە ئەویش کەلەشێرەکەی سەربڕی و ژنەکەی پاکی کردو لێی نا، پیاوەکە دوای نوێژی ئێوارە هات و بۆ ژووری چێشتخانەکەیان بینی ژنەکەی خەوتووە چێشتەکەش هەر لەسەر ئاگرە، بەنیازی بەخەبەر هێنانی لێی نزیك بوودوە بۆی دەرکەوت کەئەمری خوای کردووە ئەویش بەبێ دەنگی لەژوورێکدا داینا و چوو ئافرەتی هاوسێکەیانی بانگ کرد بۆ ئەوەی خواردنەکەیان بۆ ئامادە بکا بەئافرەتەکەی ووت بامیوانەکەمان نەزانێ ژنەکەم مردووە نەمەوێ شین و رۆرۆ واوەیلا دوای رۆیشتنی میوانەکەمان بکەی ئافرەتەکە رازی بوو.

نان و خواردنی ئێوارە خوراو شەو تا درەنگانێ بەخۆشی لەگەڵ میواندا تاکو کاتی خەوتن بەسەری برد بەیانی دوای فاوڵتی میوانەکەی خواحافیزی کردو رویشت ئەویش بەهاوکاری خەڵکی گوندو دراوسێکانی ژنەکەی بەخاك سپاردو پرسەی بۆ دانا...

لەدوای پرسە بەماوەیەکی کەم دووبارە رۆژێك دوای نیوەڕۆ میوانێکی زۆر نوورانی هات، پیاوەکە لەجاری پێشوو زورتر پێشوازی لەمیوانی دووەم کرد بەلام چونکە لەبەر خۆ مانگانە بەولاوە هیچی نەبوو بەرخەکەی سەربڕی کوڕە ١٢ ساڵانەکەی چاوی لەباوکی بوو کەبەرخەکەی سەربڕی بەڵام براکەی لەماڵ نەبوو کەهاتەوە بەبراکەی وت کاکە باوکم چۆن بەرخەکەی سەربڕی؟... برا گەورە بەبرا بچووکی وت بڕۆ چەقۆیەك بێنە ئێستا پێت دەڵێم ئەویش بەراکردن چوو چەقۆیەکی هێنا برا گەورەکە وەکو بەرخەکە برا بچووکەکەی سەربڕی گوایە بۆی روون بکاتەوە باوکی چۆن بەرخەکەی سەر بڕیوە، لەترسا هەڵهات و لەگوندەکەیان دەرچوو، باوکی کەئەم دیمەنەی بینی کوڕە سەربڕاوەکەی هێنایە ژوورێك و چووە لای میوانەکەی وتی مۆڵەتم بدە بۆ ماوەیەك هەندێ ئیشم هەیە میوانەکەی مۆڵەتی‌دا، باوکە چوو بەدوای کوڕە گەورەکەیداو لەدڵی خۆیدا وتی ئەو لەدەست چوو با ئەمیان بگێڕمەوە، کەلە گوند دەرچوو کوڕەکەی چاوی بەباوکی کەوت بەدوایدا رادەکا پەشۆکاو چاوی زەوی نەدەبینی رای دەکرد لەکەندەڵانی بەربووەوەو ملی شکاو ئەویش مرد، باوکەکە لاشەی ئەویش هێنایە بۆ لای ئەوی تر، بەڕوو خۆشی و زەردەخەنە نانی ئێوارەی لەگەڵ میوانەکەیدا خواردو بەیانی روو میوانەکەی ماڵاوایی کردو رۆیشت ئەویش دیسان بەهاوکاری خەڵکی گوند هەردوو کوڕەکەی بەخاك سپاردو پرسەی بۆیان دانا. کەپرسە تەواو بوو خۆی بەتەنها لەماڵابوو دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ دیسانەوە یەکێ لەدەرگای داو زور لەدوو میوانەکەی پێشوو نوورانی ترو بەشەکەوت تر بوو، بەمیوانی ئەویش لەرادەبەدەر پێشوازی کرد... لەبەر ئەوەی هیچی لەماڵا نەبوو لەمانگاکانەی زیاتر بۆ ئەو میوانە شایان بێ لەبەرئەوە مانگاکەی سەربڕی و ئافرەتێکی دراوسێی هێنا پێشتیان بۆ دروست بکات لەپڕ کچەکەی بۆ پرسەی دایکی و براکانی هاتەوە کەچاوە بەخوێنی مانگاکە کەوت دڵی وەستاو مرد. ئافرەتەکە چوو بانگی پیاوەکەی کرد کە لەگەڵ میوانەکەیدا دانیشتبوو پیاوەکە لاشەی کچەکەی هێنایە ژوورێ و بەئافرەتەکەی وت با میوانەکەمان نەزانێ تا دەڕوا ئافرەتەکە وتی باشە. پیاوەکە ئەو شەوەی بەڕوو خۆشی لەگەڵ میوانەکەیدا بردە سەر بەیانی زوو میوانەکەی خوا حافیزی کردو رۆیشت



ئەویش دیسان لەگەڵ دراوسێکانیو خەڵکی گوندەکەی کچەکەیان بەخاك سپاردو پرسەی بۆ دانا، لەدوای پرسەو سەرەخۆشی دوورو نزیك پیاوەکە بڕیاریدا کەهەموو شڕو شیتاڵی ماڵەکەی بفرۆشێو کۆچ بکات بۆ شوێنێکی تر، لەسەر هەمان بڕیار هەموو ماڵەکەی فرۆشتو بوو بەخاوەن چەند لیرەیەك،و کۆچی کرد ماوەیەکی زۆر رۆیشت لەدوای رۆژو شەوێ رێگا بڕین لەهەورازێ ویستی سەرکەوێ لەپڕ کەسەیری کرد مارێكو گورگێكو شێرێك سەری رێگەکەیان لێی گرتووە لەترسا هەردوو ئەژنۆی شل بوو زمانی وەستاو بورایەوە، کەبەهۆش هاتەوە بینی وا مارو گورگو شێرەکە بەدەوریدا دێنو دەیلێسنەوە بەفەرمانی خوا هەرسێکیان هاتنە زمان مارەکە وتی بەدوومان کەوە ئەم هەورازە جێگای منەو کەهەر پێویستیەکت بەمن بوو وەرە ئێرەوە بڵێ ئەی ماری هەوراز من فلان کەسم هاتووم بۆ لات خێرا من دەگەمە خزمەتت مارەکە رۆیشتو پیاوەکەو گورگو شێرەکە ملی رێگەیان گرت ماوەیەك رۆیشتن گورگەکە وتی ئەو دۆڵە دەبینی ئەوە جێگای منە هەر پێویستیەکت بوو وەرە ئەو دۆڵەو بڵێ ئەی گورگی دۆڵ من فلان کەسم هاتووم بۆ لات خێرا دێمە خزمەتت، گورگەکە رۆیشتو پیاوەکەو شێرەکە ملی رێگایان گرت تاکو گەیشتنە دارستانێ شێرەکە وتی مام فلان هەر شتێکت لەژیاندا پێویست بوو وەرە بۆ ئەو دارستانەو بڵێ ئەی شای دارستان من فلان کەسم هاتووم بۆ لات خێرا دێمە خزمەتت خوا حافیز شێرەکە چوو بۆ دارستانەکەو پیاوەکە ملی رێگای گرت زۆر رۆیشت تاکو ئێوارە گەیشتە دەوروبەری شارێ پێش چوونە ناو شار کەلاوەیەك سەرنجی راکێشا، کەچووە پێشو لەکەلاوە نزیك بووەوەو چووە ناو کەلاوەکە بینی کوڕێکی لاو لەژوورێکی ئەو کەلاوەیەدا هەندێ کەلوپەلو شیتاڵی هەیە کەپێی بنوێ، سلاوی لێ کردو ئەویش وەلامی دایەوە پیاوەکە بەلاوەکەی وت ئەتوانی ئەو شەو جێگام بکەیتەوە؟ لاوەکە وتی بێ شك ئەمشەو لەخزمەتتدا دەبم، پیاوەکە دانیشتو لاوەکە بەخێر هاتنی کردو دەستیان بەگفتوگۆکرد پیاوەکە بەلاوەکەی وت رۆڵە من بێ کەسوکارم وەرە خۆت بکە بەکوری من خوا مەزن کەماڵی دنیای داینێ ژنت بۆ ئەهێنمو ژیان بەخۆشی بەیەکەوە بەسەر دەبەین، لاوەکە لەدڵی خۆیدا وتی دیارە ئەم پیاوە پارەدارو ئەبێ وای هەڵخەڵەتێنم کەرۆژانە شتومەكو خواردەمەنی بکڕێو بەبێ ئەوەی کاسبی پیشان بدەم هەموو رۆژێ بیبەمە ناو شارو بەبیانووی کاسبی نەبوون بیگێڕمەوە بۆ شێرە، تا شەوگاریچکی درەنگ دانیشتن ئینجا نوستن بەیانی زوو پێکەوە چوون بۆ ناو شار کوڕە لاوەکە ماوەیەك پیاوەکەی سوڕاندەوەو ئینجا وتی ئەمڕۆ کاسبی نیە هەندێ خواردنو پێداویست بکڕە بەیانی کاسبی ئەکەین بەو شێوەیە هەموو رۆژێ دەچوونە ناو شارو دەگەڕانەوە تاکو دوا لیرەی گیرفانی پیاوەکە تەواو بوو، لەدوای دوو سێ رۆژ بێ ئیشیو برسێتی کەکوڕە لاوەکە تەنانەت پیاوەکەی بۆ ناو شاریش نەدەبرد پیاوەکە بیری کردەوە ئەگەر چارەسەرێ بۆ خۆی نەکا لەبرسا دەمرێ لەم بیرکردنەوەیەدا یادی گورگەکەی کردەوە بەیانی زوو رووی لەدۆڵی جێگای گورگەکە کرد رۆیشت تاکو گەیشتە دۆڵەکە لەوێ بەدەنگێ بەرز هاواری کردو وتی ئەی گورگی دۆڵ من فلان کەسم هاتووم زۆر پێویستم پێتە، زۆری پێنەچوو گورگەکە بەهەڵەداوان هاتوو سلاوی کرد وتی فەرموو هاوڕێ بڵێ بزانم چیت پێویستە بۆتی جێبەجێ بکەم، پیاوەکە وتی بێ پارەییو دارایی بەجارێ شالاوی بۆ هێناوم برسێتی بۆ لای تۆی هاوڕێمی هێنا جا ئەگەر چارم نەکەی دوور نیە لەبرسا بمرم، گورگەکە وتی هاوڕێ بڕۆ لەو کەلاوەی کەخۆتو کوڕە لاوەکە تێیدان لەژێر ئەو گاشە بەردەی لەبن دیواری ژوورەکەتاندایە کوپەیەك لیرەی تێدایە دەری بکەو بەخۆشی ژیانی پێ ببەسەر ئیتر خواحافیز من وا دەڕۆم، پیاوەکە ملی رێگای گرتو گەڕایەوە بۆ کەلاوەکە بەهەڵیزانی کوڕە لاوەکە لەوێ نەبوو چوو گاشە بەردەکەی لاداو کوپەیەك لیرەی بۆ دەرکەوت بەهێمنی کوپە لیرەکەی هێنایە ناو کەلاوەکە لەجێگایەك شاردیەوە بەلام مستێ لیرەی لێدەرکردو خستیە گیرفانییەوە، ئێوارە کوڕە لاوەکە بەدەستی بەتاڵ هاتەوە، پیاوەکە لێی پرسی رۆڵە دیارە ئەمڕۆش کاسبی نەبووە کوڕەکە وەلامی دایەوە وتی نەخێر جا کاسبی ماوە، پیاوەکە بەرووخۆشی وتی رۆڵە ئەوە لیرە بڕۆ لەناو شار خواردنو هەموو پێداویستیەکان بکڕە، کوڕە لاوەکە وتی ئەو لیرە زۆرەت لەکوێ هێناوە باوکە گیان دیارە لیرەی تریشت هەیە توخوا دەپێم بڵێ خاوەنی چەند لیرەی با دڵنیابم، پیاوەکە لەبەر ناوی خوای مەزن وتی رۆڵە هی ترمان زۆر زۆرە، لاوەکە بەفێڵبازی خۆی توانی بەپیاوەکەی ئاشکرا بکات کەکوپەیەك لیرەی هەیە لەبەر ئەوە وتی ئەگەر نیوەی لیرەکانت نەدەی بەمن ئێستا خەبەری جەندرمەی پاشا دەدەم کەتۆ خەزێنەت دزیوە، پیاوەکە بەنیوە رازی بوو بەلام کوڕە لاوەکە تەماحی زیاد کردو وتی ئەگەر هەموو لیرەکان نەدەی بەمن تەنها مستێکی بۆ خۆت بێ خەبەر دەدەم، پیاوەکە بەمە ناڕازی بوو وتی بڕۆ خەبەر بدە، زۆری نەخایاند کوڕە لاوەکە خەبەری داو جەندرمە پیاوەکەیان گرتو کوپە لیرەکەیان بردو تەنها مستێ لیرەیان



بەخەڵات دا بەکوڕەکە، پیاوەکە درایە دادگاو لەزیندان توند کرا تا ماوەیەکی زۆر، تاوای لێهات بەتەواوی توانای نەما بەرهەڵستی ژیانی زیندانی بکات، رۆژێك گوێی لەدەنگی دار شەقی کوێرێك بوو لەدەرەوەی زیندانەکە بەدەنگی بەرز هاواری کردە کوێرەکەو وتی مامەگیان ئەتوانی بچی بۆ ڕێگای فلان ئەو ڕێگایە بگرەو برۆ تا دەگەیتە هەورازێ ئەوی بڵێ ئەی ماری هەوراز من هاوڕێی مام فلانم کە هاوڕێتە ئەگەر فریای نەکەوی فەوتاوە لەزینداندا. پیاو، کوێرەکە خوای مەزن ملی ڕێگای پێ گرتوو ڕۆیشت هەتاکو گەیشتە هەورازەکە لەوێ هەواڵی زیندانی بەمارەکە گەیاند گەڕایەوە. بەیانی زوو پاشا مارێکی درێژ لەبالآی ئالا بوو سەری لەبینەقاقای ڕاگرتبوو هەموو جەندرمەو وەزیرە زاناکان لەسەری کۆبوونەوە بۆ چارەسەری ئەو بەلایە، بیریان کردەوە ئەگەر بەگوللە لێی بدەن لەوانەیە بەر پاشا بکەوێ، زاناکان وتیان پاشا خێرو خێرات بکە پاشا نیوەی سەروەت و سامانی کرد بەخێر سوودی نەبوو ئینجا وتیان بەندەکان ڕزگار بکە، مارەکە کەئەمەی بیست کەمێ جوڵا، پاشا بڕیاریدا هەموو بەندەکان ڕزگار بکرێن. هەموو بەندەکان ڕزگار کران. مارەکە نەجووڵایەوە، ئەمجا جەندرمەیەك وتی هەموو بەندەکان ئازاد کران بەلآم ئەو بەندەی لەزیندانی یەك کەسی دایە کەخەزێنە دزی بوو ئازاد نەکراوە ئەگەر مابێ، مارەکە جارێکی دیکە کەمێ جوولا پاشا وتی بڕۆن خێرا ئەو بەندە بهێنن، زۆری نەخایاند پیاوەکەیان هێنا مارەکە تەماشای کردو هاتە زمان و وتی بیبەن بۆ گەرماو با خۆی بشواو دەستێ جلی تازەی لەبەر بکەن ئەم کارەش ئەنجام درا ئینجا مارەکە وتی پاشا فەرمان بدە تاکە کچەکەتی بۆ مارە بکەن و بکرێ بەجێگری خۆت، پاشا ئەو فەرمانەشی دا بەچاوتروکانێ مارەکە ون بوو، پیاوەکە بوو بەزاوای پاشاو جێگری، لەدوای چەند ساڵێ پیاوەکە بوو بەخاوەنی دوو سێ منداڵ و پاشا کۆچی دوایی کردو ئەو بوو بەپاشا. زۆربەی کاتی بەراووشکار لەگەڵ دەستەی وەزیران بەسەر دەبرد ڕۆژێ بەرێکەوت چوون بۆ ڕاو بۆ نزیك ئەو دارستانەی کەشێرەکە بەر لەچەندەها ساڵ بەپیاوەکەی ووت تێرە جێگای منەو ئەگەر پێویست پێم بوو وەرە بۆ لام، پاشا هەڵوێستێکی کردو ماوەیەك چووە ناو بیرە ڕابردووەکانیەوە و ووتی برایان من بەتەنها دەچمە ناو ئەو دارستانە ماوەی یەك کاتژمێر ئەگەر نەهاتمەوە ئەسپەکەم بەتەنها هاتەوە بەبێ خۆم ئیتر چاوەڕوانی من مەکەن و پاشایەك بۆ خۆتان و وڵات هەڵبژێرن و بەدوای مندا مەگەڕێن وەزیرەکان سەری ڕەزامەندیان بۆی دانواند و پاشا چووە ناو دارستانەکە بەدەنگێکی بەرز وتی ئەی شای دارستان من فلان کەسم هاتووم بۆ لات، لەپڕ شێرەکە پەیدا بوو پێشوازیەکی زۆری لەپاشا کردو ئەحواڵی پرسی، پاشا بەوردی سەرگوزشتەی ژیانی بۆ باسکرد دوای ماوەیەك شێرەکە وتی من دەڕۆم هیچ نیشێکت بەمن هەیە پاشا وتی بەڵێ ئەمەوێ لەگەڵتادا بێم شێرەکە ڕەزامەندی نواند پاشا ئەسپەکەی بەرەڵلا کرد. دوای شێرەکە کەوت زوو ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە دەرگایەك بەئەمری خوای مەزن دەرگاکە بۆ شێرەکە کرایەوە، چووە ژوورەوە پیاوەکە بەدوایدا چوو چاوی بەگوڵزارو دارستانێك کەوت کەلەژیانیدا شتی وای نەبینی بوو لەو گوڵزارەدا چاوی بەکەڵەشێرەکەی کەوت کەبۆ یەکەم میوانی سەری بڕی بوو کەلەشێرەکە قولانی پیاوەکە ئاوڕێکی لێداوە، شێرەکە وتی من ئەمووت ئاوڕ لەهیچ مەدەرەوە زۆر ڕۆشتن تاکو گەیشتنە دەرگایەکی دیکە دیسان لەپێشیان کرایەوە چوونە ژوورەوە گوڵزارێك بوو زۆر لەیەکەم گوڵزار جوانترو بۆندارترو میوەی زۆرتر بوو لەناو گوڵزارەدا چاوی بەبەرخەکەی کەوت بارانی ئەویش ئاوڕێکی لێدایەوە شێرەکە دیسان وتی پێت دەڵێم ئاوڕ مەدەرەوە، بەردەوام بوون لەڕۆیشتن گەیشتنە دەرگایەکی دیکە ئەویش لەپێشیان کرایەوە چوونە ژوورەوە گوڵزارێکی زۆر ئەدووەم گوڵزار جوانتری بینی لەڕۆیشتندا مانگاکەی کەبۆ میوانی سێیەم سەر بڕێ بوو بینی و مانگاکە بۆرانی ئەویش ئاوڕێکی دایەوە، شێرەکە بەتووڕەیی وتی ئاوڕ مەدەرەوە. ڕۆیشتن پیاوەکە لەپێش دەرگایەکی گەورە خەوی لێکەوت دوای بەئاگا بوونەوەی لەگەڵ شێرەکەدا چوونە ژوورەوە لەو دەرگایە بینی ژنەکەی و هەردوو کوڕەکەی و کچەکەی وان لەناو ئەو باخ و گوڵزارەدا کەلەدنیادا شتێکی وانییە. شێرەکە وتی مام فلان تۆ کەخەوتی لەپێش دەرگاکە ئەوە مردی و ئێرە بەهەشتی خوایە، ئەو سێ میوانەی لەدنیای فانی هاتنە میوانت حەزرەتی جبرائیل بوون وە هەر سێ مارو گورگوگو شێرەکەش کەمنم دیسان ئەوین دەبا پیرۆزت بێت (بەهەشتی خوا) چونکە تۆ خۆشەویستی خوای. جا خوێنەری بەرێز هیوادارم هەموو ڕێبازی خۆشەویستیی خوای مەزن بگرینە بەرو ڕێز لەمیوان بگرین، منیش هاتمەوە کەوشەکەم دڕاو هیچم پێ نەبڕا.

**سەرچاوە:** ئەم چیرۆکە فۆلکۆریەم لەباوکم (حاجی هیدایەتی حاجی حەسەنی کفری) بەر لە(٢٠) ساڵ لەمەوبەر وەرگرتووە.



# ئەرك و ماف لە نێوان كەمینەو زۆرینەدا لەروانگەی ئیسلامەوە

*محەمەد بەهادین بەرزنجی*

ئایا رەوایە کە موسڵمانێک سەرۆکایەتی ولاتێک بکات کە زۆربەیان موسڵمان نەبن؟

ئایا رەوایە مزگەوتی موسڵمانان لە دەروازەی شاری مەسیحی یان جولەکە یان هی دیکە دروست بکرێت؟ ئایا دەبێت رۆژی پێنج جار بانگ بدرێت لە کۆمەڵگەیەکی ئەوروپی کە هیچیان موسڵمان نەبن؟ یان ئەگەر هەشبن ژمارەیان کەم بێت؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانەی سەرەوە، دەبێت بە رێسای زۆرینەو کەمینەدا بچینەوە.. بۆیە رێز گرتنی ئاڵوگۆڕکراوی نێوان ئەو دوو توێژە (زۆرینەو کەمینە) زۆر لە مافی هەردوولا دەپارێزێت بە گیانێکی شارستانی و دوور لە دەمارگیری و دواکەوتوویی مامەڵە لەگەڵ رووداوەکاندا دەکەین.

بەر لە هەموو شتێک پێویستە ئەم پرسیارە بخەینە روو (( کەمینەی ئایینی، چی لە کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخ مەبەستە؟ )) لە وەڵامدا دەڵێین: کەمینەی ئایینی داوای دابین کردنی سەربەستی بیروباوەڕو بەجێ هێنانی یەکسانی لە ئەرک و ماف دا لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکات.

ئەگەر بمانەوێت بە تێروتەسەلی بە ئەنگەوە هاتنی کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ ئەو دوو بنەمایە (ئەرک و ماف) پیشان بدەین، ئەوا مەسەلەی سەربەستیی بیروڕا لە زۆربەی ئاینە ئاسمانییەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە، بەر لە هەزار ساڵ زیاتر بیروباوەڕی مەجوسییەکان و زەردەشتییەکان - سەربەستی تەواوی خۆیان هەبووە... بۆیە لێرەدا باسەکە دەخوازێت هەڵوەستە لەسەر سێ خاڵی سەرەکی بکەین

**یەکەمیان**: لە هیچ دەقێکی قورئان و سوننەدا نەهاتووە، پەرستن و داب و نەریتی ئایین لە هیچ کەسێکی غەیرە موسڵمان قەدەغە بکرێت، قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێن دا ئاماژەی کردووە بە ئایینی دیکە، بە مامەڵەی نەرم و مرۆڤانە داوای لە موسڵمانان کردووە کە لەگەڵ غەیری خۆیان دا هەڵ بکەن.

**دووەمیان**: واقیع و پراکتیکە مێژووییەکان لەم بوارەدا، لە رێڕەوی گشتی ئەو ئایینە ئاسمانییانەدا پێویستە لانەدەن و دەبێت موسڵمانان بە شێوازی دوور لە دەمارگیری و نەتەوە پەرستی هەڵسوکەوت بکەن وریا بن لە رەفتارکردن و بیر لە ئاکامە سلبی و ئیجابییەکانی بکەنەوە.

**سێیەمیان**: پراکتیزەکردنی رێنمایی وداب و نەریت و بیرباوەرەکانی ئەو - کەمینە - یانە دەبێت لە هێڵی گشتی زۆرینە لانەدات و ئەنجامیشیان بە شێوەیەک بێت کە چێژی گشتی لەبەر چاو بگیرێت و ئەمەشیان بە پێی کات و شوێن جیاوازە. پاشان رۆڵی ئێمە لەگەڵ کەمیندا دێت، ئەویش یەکسانییە لە ماف و ئەرکەکان لەگەڵ زۆرینەدا، لێرەدا دەقە شەرعییەکان بەرجەستە دەبن، هیچ بوارێک بۆ ئیجتهادو خستنە رووی بیرو سەرنج ناهێڵنەوە، ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە هەموو مرۆڤ و نەتەوەیەک بە یەکسان سەیر دەکات و دووپاتی دەکەنەوە کە لەیەک بنەچەو دایک و باوکن و پەیوەندی رەسەنی مرۆڤایەتی بە یەکتریان دەبەستێتەوە.

بناغەی بەهێزی یەکسانی، لە دەقەکانی قورئان و سوننەدا هاتووە ، تا رادەیەک بۆتە یاسایەک لە مامەڵە کردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا، پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرموێت: **((من اذی ذمیاً فلیس منا)) یان ((فأنا خصیمة یوم القیامة))** ئەو ئازاردانە تەنیا بواری مادی و جەستەیی ناگەیێنێت، بەڵکو ئازاردانی مەعنەویش دەگەیێنێت.

بێجگە لەو خاڵانەی ئاماژەمان پێ کردن، دەتوانین هەندێک نموونە بێنینەوە کە دەیسەلمێنن، زۆرینە هەمیشە بەسەر کەمینەدا سەردەکەوێت، دەرچووی حزبێکی دیاریکراو لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە یەکێک لە ولاتانی غەیرە ئیسلامیدا، لەکۆتاییدا ئەو حزبە

دەسەڵاتی حوکم لەو وولاتەدا دەگرێتە ئەستۆ. ـ ـدا دەبێت و بگـرە پێویسـتە لەسـەر حزبـی کەمینە کـ ـ ی رایـەڵی فەرمانـەکانی حزبـی زۆربنـەی سـەرکەوتور بکـ ـت. بـێ گومان ئەو نموونەیە یەکێکە لەو نموونانەی کە ـ ـ وولاتـەدا جێ بـەجێ دەبێت کـە ئیسـلام بـەڕێوەبردنی ک ـ بارەکـانی دەگرێتە ئەستۆ... بـەڵام کەمینـەی مەسیحی ـ ـن جولەکە یان ئاینی دیکەی تێدایە...

جیاوازی نێوان نەتـەوەو گـەلان. روکـ ـ ـ دنیایی‌یە بە پیی بیر و باوەڕ و ڕەگەزو ڕەنگیانو نەمە ـ ـ لە قورئان دا بە پێچەوانە دەکەوێتەوە **((انا خلقناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم))**.. ـ ـندێ لە دەبەستن کە سەنگی مەحەکە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە نووسـەرو فـەقێ و زانایـانی ئیسـلام پشـت بـە چـەند ئایەتێک موسڵمانان لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەی ئیسـلامی لـە غـەیری خۆیان چاکـترە... یـەکێک لـەو ئایەتانـە **((لا يتخذ المؤنون الكافرين أوليـاء مـن دون المؤنيـن ومـن يفعل ذلك فليس من الله في شيء، الا ان تتقـوا منهـم تقاة، ويحذركم الله نفسه، والى الله المصير)) (ال عمران - ٢٨)**، لێرەدا ئاماژە بۆ کەمینـەی کوفر دەکرێت کە ئەهلی کتێب ناگرێتەوە لە ئایینە ئاسمانییەکان، بەڵکو کافرەکـ ـن مەبەستە، ئەوانەی کە دژی بیروباوەڕی پیرۆزی ئیسـلامی و ڕێز لە یاساو داب و نەریتەکانی ناگرن.

---

# بزووتنەوەی کوردایەتیو ئایینی ئیسلام

**کەباس لەکێشەی موسـوڵمانانی جیهان دەکرێـت بەدەگمـەن کێشـەی کورد وەك کێشـەیەکی گرنگـی ئـەو نەتەوەیە دەخرێتە بەرچاو.**

**بـێ هـۆ نـەبوو کەکوردسـتان لەساڵی ١٩١٨ی زایین پارچە پارچە کراو بەسـەر چـەند ولاتێـك دابـەش کرا.. ئەگەر لـەم کـردارە بکۆڵینـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت کـەپیلانێکی (بـەریتانی - ئەوروپی‌یـە) دژ بەئیسـلام.... چونکـە رۆژئـاوا گەیشـتبووە ئـەو قەناعەتـە ئەگـەر (کورد یەکگرتوو و بەهێز بێت ئـەوا ئـایینی ئیسـلام بـەهێز دەبێـت) وەبەپێچەوانـەوە... دەشـێ ئـەوە بگوترێت کەهەندێ لەسـەرکردەکانی ئەورروپا داخی ئەوەیان لەدڵدا مـابوو کەتۆڵـەی (سـەلاحەدینی ئـەیوبی) لەمیللەتی کورد بکەنەوە..**

**دەوڵەتـە ئیسـتعماری‌یەکان هەستیان بەوە کردبوو ئەگـەر کـورد سـەربەخۆو یـەکگرتوو بێـت ئـەوە بەرژەوەندی‌یەکانی ئـەوان دەکەوێتـە مەترسـی - هـەر بۆیـەش (فـون مۆلتگە) گەریدەو ژەنەراڵی ئەڵمانی لەگەشـتەکەیدا بـۆ کوردسـتان لەسـەردەمی عوسمانی‌یـەکاندا گوتبـووی (ئەگـەر میللـەتی کـورد یـەکگرتوو بێـت جێگـای مەترسـی‌یەکی گەورەیـە) بـۆ ئـەو مەبەستەش تا ئێسـتا پیلانـەکانیان دژ بەکوردسـتانو ڕێبـازی پـیرۆزی ئیسلام بەردەوامە..**

**ئـەوەی لـێرەدا مەبەسـتمانە ئامـاژەی بۆ بکەین هەندێ لەخەڵکی موسـڵمان مێشـکیان وا زاخ دراوە ئەگـەر بـاس لـەمافی چارەنووسـی میللـەتی کـورد بکـەین ئـەوە داخوازای‌یـەکی ڕەگەزپەرسـتیو جیابوونەوەیـەو دژ بەدەوڵـەتانی ئیسلامو ناوچەکە.**

**میللـەتی کـورد لـەدێر زەمانـەوە نەتەوەیەکی خواناسو خاوەن ڕەوشتو نـەریتی کۆمەڵایـەتی بـەرز بـووە کەلەهەندێ‌دراوسـێ‌یەکانی جیادەکاتەوە - هەمیشـە دوور بـووە لـەبت پەرستیو هـەندی ڕەوشـتی خێلەکی وەك بـەتاڵان بـردنو زینـدە بەچاڵ کردنی کچ...**

**نموونـەی دینـداری بزووتنـەوەی کوردایـەتی لـەوە دەردەکـەوێ کەسەرکردەی زۆربەی ڕاپەڕینەکانیان پیـاوی ئـاینی بـوون، وەك شـێخ سـەعیدی پیرانو شـەهید قـازی محەمەدو شێخ مەحمودی نەمرو مـەلا مستەفا بارزانی ئەوە خۆی لـەخۆیدا بەڵگەیەکی زینـدووە کەکوردایـەتی هەمیشـە هـێزو توانـای خـۆی لەئیسـلامەتی وەرگرتـووە.. هـەر بۆیەش لەو باوەڕەدایین بوونی کیـانی سـەربەخۆی کـورد زیـاتر سـوود بەئیسـلام دەبەخشێتو بـەهێزتری دەکات.**

**قەرەنی ئەسوەد چەخماخچی**
**ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەتی ی.م.ك**



# ئاینی ئیسلام و.. چۆنیەتی پەروەردەکردن و گۆشکردنی منداڵان

ئامادەکردنی: حەلیمە سەعدوڵڵا

هەندێك جار سزادان، بۆ سەروەردەکردنو گۆش کردنی منداڵ، پێویستە. بەلام چەوساندنەوەو سەر شکاندنەوەی منداڵ، کاردەکاتە سەر هەستو سۆزو ئاوەزی سەکاملی ئەو منداڵە کە سەرجەم خانەکانی پێگەیشتنی دماخو پێکهاتەی هەستو عەقل دەوروژێنێو بەسەر یەکدا، دای دەرمێنێ؛ کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا چەوساندنەوە)ی منداڵە؛ وەك زۆر لەکێشە کۆمەلایەتیەکانی جیهانی ئەمرۆ، کە تێکرای منالان: پێوەی گیرۆدەن،و تێیدا دەتلێنەوە.. بەلام کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات: ئەم دیاردەیەی نەهێشت، کەلەسەدەی چوارەمی زاییندا ئینگلیزەکان منالەکانیان بە مەلۆتکەیی دەخستە دەریاوە، کە وەك تاوانێك دەرحەق بە منالان پیادە دەکرا لەو سەردەمەدا، هەروەها لەسەردەمی فەرمانداریەتی فیرعەونەکانی میسردا؛ منالەکانیان رووبەرووی دەمی شمشێر دەکردنەوەو بە ساواییو لەسەر پشتی لانکەدا سەریان دەبرین، جگە لەوەش والیەکانی سەردەمی (حەزرەتی مەسیح)یش، منداڵیان دەکوشتو زیندە بە چاڵیان دەکردن، دیارە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش ئەم دیاردەیەی بەکارێکی دڕندانەو وەحشی گەرانەی عەرەب لەقەڵەم دەدا وەك ئەوەتا خوای گەورەو بەخشندە لە ئایەتی (١٤٠)ی سورەتی ئەنعامدا دەفەرموێت: **(قَدْ خَسِرَ الذين قتلوا أولادهم سنها بغير علم)**

بەڵێ هاوکات لەگەڵ جەژنی لەدایك بوونی حەزرەتی (محمد) پێغەمبەر (د.خ)و هاتنی ئایینی ئیسلامدا، دیاردەی کوشتنو زیندە بەچاڵ کردنی منداڵ،أ یاساغ کراو ئەو بڕیارە پوچەڵ کرایەوە کە بۆ قەلاچۆکردنی منداڵان پیادە دەکرا.. بێ شك ئایینی پیرۆزی ئیسلام چەوساندنەوەی لەسەر هەر یەکێك لە کۆیلەو ژێر دەستەو ئافرەتو منالان راگرتو بڕیاریدا تێکرای چینو توێژەکانی کۆمەڵو کۆمەڵگای ئیسلامی مافەکانیان بپارێزرێتو داکۆکی لەو دیاردەیە بکەن، کەنیشانەی زۆر بوونی کۆمەڵو کۆمەڵگای پێوە دیاربوو هەر چەندە دیاردەی قەلاچۆکردنی منالان لەجیهاندا بەتەواوی بنبڕ نەکرا، بەلام لە ساڵی (١٨٧٤)ی زایینی ئەمەریکا یەکەم ولات بوو کە (یاسای پاراستنی منالێ) دەرکرد...



منداڵ لە روانگەی ئایینی ئیسلامەوە، پیرۆزەو ریزی لێ دەگیرێت چونکە (ریژەی زیاد بوونی دانیشتوانی کۆمەڵگای ئیسلام) بەپەروەردەکردنو گۆش کردنی منداڵ بەستراوەتەوە بەتایبەتی لەکاتی، غەزەواتەکانی ئیسلامدا لەسەردەمی جاهیلیدا چونکە گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵاتو فەرمانداری لە هێزو زۆربوونی لەشکرەکانیاندا رەنگی دەدایەوە، بۆیە هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، دیاردەی چەوساندنەوەو (مەرگی منالانیان) لەتەواوی جهانی ئیسلامی قەدەغەکردو سزایان لەسەر هەڵگرتن: سزاو لیدانو هەرەشەو لێ پێچانەوەی مندالان، لەلایەن یەکێك لە ئەندامانی خێزانەوە خۆی لە خۆیدا کارێکی مەترسی داری دژ بە هۆشو گەشەی خانەکانی عەقڵو دەماغە، کە ریگا لە نەشو نماو پێگەیشتنی منداڵ دەگرێو رووبەرووی نەفامیو کەم هەستو کەم عەقڵی دەکاتەوە، بێ گومان منداڵ لەگەڵ یەکەم شریخەو چەخماخەی لەدایك بونیا، مێشکێکی بەتاڵو سۆزێکی جوانو پەپولەیی هەیە، کە پێویستە لەسەر باوكو دایك لەرێگای پەروەردەیەکی نەرمو نیانەوە ئەو مێشكو سۆزو هەستە پەپولەییە گۆش بکاو بەکاری چاكو خورەوشتی بەرز پری بکەنەوە. ئاشکرایە سەر شکاندنەوەو هەرەشەو چاو سورکردنەوە بەناوی پەروەردەو گۆش کردنەوە، تاوانێکی گەورەی ترسناکە دژ بە ئیسلامە کە دەرحەق بە منالان دەکرێت. ئەمە جگە لەوەی کە منالەکە دووچاری بڕوا بە خۆ نەبوون دێت، هاوکارت، توشی لەدەست دانی کەسایەتی خۆی دەبێتو (نەخۆشی دەروونی)یش تەنگ بە عەقڵو مەنتیقو هەستو نەست هەڵدەچنێ، کە مەحالە (منالان) لێی قورتار بن، دیارە هۆکاری دەسپێکی تاوانو سزاش لە پەروەردەکردنو گۆش کردنی منالا، بەرێژەی لە ٩٥٪ لەلایەن دایكو باوکەوە، ئەنجام دەدرێ... دیارە رێژەی لە ٥٪یش دەورووبەر کاریگەرییەتی خۆی بەسەردا فەرز دەکات.. ئێستا لە کوردستانی ئیسلامیشدا خەڵکێکی زۆر هەژارو کەم دەرامەت هەن لەدەستی منالەوە بژێوی ژیانو گوزەرانیان دەستەبەر دەکەن کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا پەروەردەیەکی ترسناکە، هەم لەباری لەدەستدانی ئەخلاقی منالەوە/ هەم لەباری لەدەست دانی کەسایەتی خێزانەکەیەوە، جگە لەوەی کە لەخوێندن دادەبڕێتو گەلوڕو تەمەڵ دەردەچێ.. دیارە ئەم جۆرە گۆش کردنەی منالْ واتای ئەوە ناگەیەنێت، کە منالەکانیان فێری کارکردنو کاسبی دەبن.. بەڵکە چەندین فاکتەرو دەرئەنجامی خراپی لی دەکەوێتەوە، بەڵام باوكو دایکان دەتوانن بەهۆی رێنماییەکانی ئایینی ئیسلامی پیرۆزەوە، رێگای پەروەردە کردن بۆ منالەکانیان هەڵبژێرن، ئەویش لە روانگەی پتەوکردنی پەیوەندیو هەماهەنگیەتی توندو تۆڵەوە دەبێت لەگەڵ دەورووبەرو هۆکارەکانی گۆشو پەروەردەکردنو بەستنەوەیان بەدابو نەریتی بەرزی کۆمەڵو کۆمەڵگاکانیانو نەهێشتنی تێپەڕاندنی ئەو سنورەی ئایینی ئیسلام بۆی داناون.

**سەرچاوە**


- قورئانی پیرۆز، ئایەتی (١٤٠) سورەتی (الانعام).
- گۆڤاری (العالم) ژمارە (٥٦٣) لەندەن.
- الوعی الاسلامی.
- چەند ژمارەیەکی رۆژنامەی یەکگرتوو.
- چەند ژمارەیەك لە گۆڤاری دەنگی زانا.



# باوەڕی تەواو



* شێخ قاسم رەسوڵ بەرزنجی*

**بێ گومان هەر ئادەمیزادێک موسڵمان بێت مەرج نیە لە هەمان کاتدا ئیمانداری تەواو بێت چونکە زۆران هەن ئەگەرچی موسڵمانن بەڵام ئایینی پیرۆزی ئیسلام لێیان بێ بەریە لەبەر نارەوایی کردەوەکانیان و ئەجولانەوەیان بە گوێرەی پەیڕەو و پرۆگرامی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەر (د.خ) وە بۆ ئەوەی بزانین چۆن ئیمان لە دڵمانا جێگیر ئەبێ بە تەواوی و ئادەمیزاد لەچ کاتێکدا پێی ئەوترێ ئیمانداری تەواو ئەوا چەند فەرموودەیەکی بە نرخی پێغەمبەر (د.خ) بە نموونە ئەهێنینەوەو مەبەستەکانیان بە ووردی شی ئەکەینەوە:**

لە یەکێک لە فەرموودە پیرۆزەکان پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ **[من احب لله وابغض لله واعطى لله ومنع لله، فقد استكمل الايمان]**. پێویستە هەر خۆشەویستە کە لە دڵی موسڵمان بێت بۆ خواو لە پێناوی خوا بێت هەروەها لە چوارچێوەی سنوری دیاری کراوی مرۆڤی موسڵمان بێت وە هەر کەسێکی خۆش ویست بۆ خوا خۆشی بوێ ودڵ رەش و پڕ لە قین نەبێت و ناو دڵی و سەرزاری نەیەک بچێ ودوور بێت لە ئاژاوە نانەوەو فتنە گێری. لە لایەکی تری فەرمودەکە ئەبێ موسڵمان دژ بە هەموو کارێکی دوور لە نەریتی ئیسلامی بێت و بۆ خوا رقی لێ بێتەوە و هەردەم پابەندی ئەو ئەرکە بێت کە لەسەر شانیەتی بۆ بەرگری کردن لەهەر دیاردەیەک کە لەم جۆرانە بێت.

هەروەها ئەفەرموێ کە ئەبێ موسڵمان هەر شتێک ببەخشێ لە پێناوی خوا بێت ئەمەش ئەو بەخشینانە ئەگرێتەوە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز روونی کردۆتەوەو لەسەر موسڵمانی فەرز کردوە لەسەر بنەمایەکی عادیلانەو رێکو پێک کە نابێ پشت گوێ بخرێن چونکە جێ بەجێ نەکردنیان موسڵمان توشی بێ ئیمانی ئەکات و لە ئاخیرەتدا نائومێدی ئەکات. لە دوابڕگەی فەرموودە نیشانمان ئەدا کە ئەبێ موسڵمانی ئیماندار هەموو کارێک لەخۆی قەدەغە کات کە دوورن لە یاسا و شەریعەتی پاکی ئیسلامی. خوای گەورە لە قورئاندا یاساغی کردوون و بەکاری شەیتانی لە قەڵەم داون. وە لە هەمان کاتیشدا ئامۆژگاری خەڵک بکات و رێی راستیان پیشان بدات بە نیازی دورکەوتنەوەیان لە کردەوەی ناشیرین و وازهێنان لەو هۆکارانەی کە لەگەڵ خواپەرستی راست ناگونجێن.

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) ئەفەرموێ: **[ذاق طعم الايمان من رضي بالله رباً وبالاسلام ديناً وبمحمد نبياً ورسولاً]** ئەم فەرمودەیە ئیمانی تەواوی بە سێ کۆڵەکە بەند کردوە کە ئەگەر بێت و موسڵمان بە تەواوی و بە بێ گومان ئیمانی پێ بێ بێ شک



ئیمـــانداره انشـــاء اللـــه وه کۆڵەگەکانیش ئەمانەن:

[ ١ ]. **من رضـي باللـه ربـاً**: واته ئیمانی تەواوی بێگەردی بە خوای گەوره هەبێ و بزانێ کە خالقی ئەرزو ئاسمانەو هەموو فەرمانێک لە سایەی ئەوەوەیەو خۆی ... ک و تەنها بە خاوەنی قودر... بەسەر هەموو دەسەلاتێکا کە نابێ گومانمان لێی هەبێ و یاخود بە هۆی شتی ... تری ... یابی خوانەخواستە لە یادمان بچێ و لێی بێ ئاگابین.

[ ٢ ]. **وبالاسلام دینـاً**: خوای گەوره لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت: **[الیوم اكملت لكم دینكم وأتممت علیكم نعمتی ورضیت لكم الاسلام دینـاً]**.

مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە خوای گەوره ئایینی پیرۆزی بەدوا ئایین دانــاوەو پەیرەو کردنی فەرزکردوه و ئاگاداری گشت ئادەمیزادێک ئەکات کە لە سەر رووی زەمین ئەکات کە لە غەیری ئایینی ئیسلام پابەندی هیچ ئاینێکی تر نەبن چونکه بە پێچەوانەوە لە دوا رۆژ خەسارەتمەند ئەبن و دوچاری دۆزەخ ئەبن. وەک لەم ئایەتە پیرۆزەی تر داکۆکی لەسەر ئەکاو ئەفەرموێت: **[ومن یبتغي غیر الاسلام دیناً فلن یقبل منه وهو في الاخرة من الخاسرین]**.

[ ٣ ]. **وبمحمد نبیاً ورسولاً**: پێغەمبەر (د.خ) نێردراوو پەیامنێری خوای گەورەیە کە ئیرشادکردنی خەڵک و بلاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامی پێ سپێردراوه بۆیە ئەبێ موسڵمان بڕوای بەم پێغەمبەره خۆشەویستە زۆر قاییم بێت و هیچ گومانی لەدڵ دا نەبێت و رێ رەوی شوێنەواری ئەو بێت و بزانێت کە رێزگرتنی و خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) واجبەو نابێ بە هیچ جۆرێک نکوڵی وکەمتەرخەمی تیا بکرێ. لە کۆتاییدا لە خوای گەوره ئەپارێینەوە کە ئیمانمان پێ ببەخشێ و ئێمەش پابەندی تەواوی پەیرەو پرۆگرامی قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بین **انشاء الله**.

**(والسلام علیكم ورحمة الله وبركاته)**

## سەرنجێک بۆ ئەو نووسەرانەی نووسینەکانیان لەگۆڤاری (خۆری ئیسلام) بلاودەکەنەوە

- ★ **نووسینەکانتان بەخەتێکی جوان بنووسرێت و دێرەکان بپەرێت و بەینیان هەبێت.**
- ★ **بابەتەکانتان دەسخەتی خۆیان بێت نەک فۆتۆکۆپی.**
- ★ **بابەتەکانتان لەسەر دیوێکی کاغەزی فۆلسکاب بنووسن.**
- ★ **بابەتەکانتان وێنەو بەڵگەنامەو نەخشەی لەگەڵ دابێت. بابەتەکە بەپێزتر دەکات و گرنگیش بەخاڵبەندیو رێنووس بدەن.**
- ★ **ناوی سەرچاوەکان لەلێکۆڵینە... نووسینەکانتان دیار بکەن.**
- ★ **هەر نووسین و لێکۆڵینەوەیەک ... گۆڤاری (خۆری ئیسلام)دا بلاودەکرێتەوە تێڕوانینی نووسەرەکە خۆیەتیو گۆڤارەکە لێی بەرپرسیار نییە.**
- ★ **هەر بابەتێک بلاونەکرایەوە، بەخاوەنەکەی نادرێتەوە.**

*** دەستەی نووسەران ***



# خۆری ئیسلام

# لە ڕوانگەی زانایانی ئایینییەوە

**سەبارەت بە دەرکردنی ئەم ژمارەیەی بەردەستان لەگۆڤاری خۆری ئیسلام وەکو پێویستی یەکی گرنگ لە ژیانی ڕۆژانەی موسڵمانان لە هوشیارکردنەوەی خەڵک لە ڕۆشنبیری ئیسلامی لە کۆمەڵگای کوردەواری دا چەند مامۆستایەکی ئایینی ڕاو بۆچوونی خۆیان لەسەر گۆڤارەکەو ڕێنمایی یان بۆژمارەکانی داهاتوو چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی پەیامی پیرۆزی ئیسلامی هەریەک بەبۆچوونی خۆیانەوە سەرنجەکانیان خستەڕوو.**



*** بەڕێز حاجی نوری قادر: بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێر:-**

ڕاگەیاندنی ئایینی ئیسلام ڕۆڵێکی گرنگی لە هوشیاری ئایینی و کۆمەڵایەتی خەلک هەیە لە پێناوی پاراستنیان لە خراپە و کاری نارەوا بە هەموو جۆرەکانیەوە، دیارە ئایینی ئیسلام قوتابخانەیەکی گەورەو پڕ ئەزموونە بە چەند قۆناغێکی جیاجیادا ڕۆیشتووە و لەلایەن خوای گەورەوە پاڵپشتی کراوەو بێگومانیش لە خزمەتی مرۆڤایەتی دابوو، هەر ئەتەوە وگەلێک لەم سەر زەمیەندا ئەوەندەی بۆی کرابێ سوودی لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەرمان محمد (د.خ) وەرگرتووە هەریەکە بە زمان و رەوشتێک تەفسیری کردووە تەنانەت ئەمڕۆ لە تۆڕەکانی ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر و کەناڵە ئاسمانیەکانیش ڕاگەیاندنی ئیسلامی ڕۆڵی خۆی هەیە بگرە دەیان کەناڵی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بە زمانی ئیسلام کار دەکەن، دەیان گۆڤار و ڕۆژنامە لەو جیهانە بڵاودەبنەوەو لە خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دایە، ئەگەرچی حزب و لایەنی واش هەیە بۆ هەندێ مەبەست پەرە بەم ڕاگەیاندنە دەدات، بەڵام خەڵک بیر و بۆچوونی خۆیان لەسەر یان هەیە و هەریەک بە جۆرێک سوودی لێ وەردەگرێت، ئەمڕۆش لە کوردستان دا لە سایەی پەرلەمان کە لەلایەن گەلەوە دامەزراوە و دیموکراتی لە بواری ڕاگەیاندن دا بەرقەرارە لە سایەی ئەم دیموکراتی یەدا دەیان حزب و لایەن و ڕێکخراوی نەتەوەیی و عیلمانی و دیموکراتیەکان لە کوردستاندا شان بە شانی یەکتر بەرنامەی ئیسلامی پەیڕەو دەکەن و بۆ بەرەوپێش بردنی ئەم ڕەوتە کەناڵی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەگەری جیاجیایان هەیەو خزمەت بەم ئاینە دەکەن.. لە پاڵ ئەمانەشدا ڕاگەیاندنەکان گرنگیان بە ئایینی ئیسلام داوەو دەیان ووتارو لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوەو دەیان بەرنامەی ڕادیۆی و تەلەفزیۆنی بۆ ئاراستەکردن و بڵاوکردنەوەی بانگ نوێژانی هەینی وتارو بەرنامەی ئاینی هەن. لەلایەن وەزارەتی ئەوقافی حکومەتی هەرێمیشەوە لە تەلەفزیۆن دا هەفتانە بەرنامەی ئاسۆی ئیسلام بڵاوکراوەتەوە لە چوارچێوەی ئەوەشدا چەندین مێزگرد لەگەڵ مامۆستایان دا کراوە، ئەوا (خۆری ئیسلام)یش لەکاتێکدا هەڵدێ کە گەلەکەمان هۆشیارەو بەو پەڕی



ئەخۆپووردنەوە ئایینەکەی دەپارێزی و گەشەی پێدەدات و پارێزگاری دەکات، کە ئەمەش لەسەر راسپاردەی کابینەی سێ یەمی حکومەت و سەرکردایەتی سەرۆک بارزانی یەوە کە گەلی کورد هەمیشە موسڵمان بووە. بەمەش زیاتر رەوتی ئایینی ئیسلام لە هەرێمەکەماندا بەرەوپێش دەچێ و مینبەری راستی موسڵمان دەبێت و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم، هیوادارم هەموو سێ مانگ جارێک لە کاتی خۆیدا بگاتە دەستی موسڵمان.

*** بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی سەبارەت بە دەرچوونی گۆڤاری خۆری ئیسلام بۆمان هاتە ئاخاوتنی و گوتی:**



* بە حەقیقەت: دەرچوونی گۆڤارێک بەو حاڵەتە: خۆی لە خۆیدا کارێکی گەورەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامیە کە بە ئەنجامی دەگەیەنێت: چونکە: دەرچوونی. کەلێنێکی گەورەی لە مێژووی رۆژنامەوانی ئیسلامیی دەکاتەو، هەروەها وەک کەلتور و کەلەپوری ئیسلام، لە خزمەت کردن بە: رێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام سوودی لێ وەردەگیرێ و ئاشکرایە، ئایینی ئیسلام لە بوارە جیاجیاکانی (مەختوتات و بەڵگەنامە ونوسراوە ئایینەکان) دەوڵەمەندەو پێویستی بە ئەرشیف کردنیان هەیە لە مۆزەخانەیەکی ئایینی وەک ئەم گۆڤارەی لەبەردەستماندایە وە هەروەها پێویستە راو بۆچوونی مامۆستایان و زانایانی ئایینی لەم گۆڤارەدا بڵاو بکرێتەوە گرنگی بدرێ بە رۆڵی ئیسلام لە جیهان و بەبەرچاوخستنی (بەڵگەنامەو مێژوویەکانی ئیسلام) بەمەبەست رۆشنبیرکردنی (نەوەی نوێ) بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵگایەکی ئایینی هاوچەرخ وە پێشنیارمان ئەوی، جگە لەو گۆڤارە، چەند کتێب و نامیلکەو دەست نوسینی ئایینی مامۆستایان بە چاپ بگەیەنرێ...

ئیتر بەردەوامیتان دەخوازم .. سوپاس بۆ ماندووبوونتان

*** بەڕێز مامۆستا مەلابەشیر خەلیل زانای ئایینی و مامۆستای پەیمانگای مامۆستایان، سەبارەت بەدەرچوونی گۆڤاری خۆری ئیسلام ووتی.**



((بسم الله الرحمن الرحيم)).. سەرەتا زۆر پیرۆزبایی لە حکومەتی هەرێم و وەزارەتی ئەوقاف و خۆمان و سەرجەم موسلمانان دەکەم بە بۆنەی دەرچوونی ئەم گۆڤارە بەراستی دەبوو زووتریش ئەم هەنگاوە پڕ خێرە ئەنجام بدرێت و دەرگای زانستی ئیسلامی لە مرۆڤایەتی و کوردایەتی بکاتەوە. خۆری ئیسلام دەکرێت لە هەموو بوارێکەوە بابەت و لێکۆڵینەوەی زانستی و کەلتوری مێژوویی و ئیسلامی بلاوبکاتەوە، تینوێتی موسڵمانان بشکێنێت و گرنگی بەقەڵەمی نووسەرە لاوەکان بداتو لە چوارچێوەی شەرعیەتی ئیسلام لانەدات و زەوابتی تەواوی هەبێت بۆ هەڵبژاردن و بلاوکردنەوەی بابەتەکان و خەتێکی راست بۆ خوێنەرانی دروست بکات، هەروەها بابەتی فیقهی بەتایبەتی (فقهي المقارن) و مینبەری هەینی کە خوتبەیەک لە مزگەوتەکان و مامۆستایان دابرێژتەوە بۆ ئەوەی را لە نێوان موسڵمانان دروست بکات. دەنگ وباسی موسڵمانانی جیهانی لەبەرەو پێش بردنی ئایین و گۆرانکاریەکانی مەزهەبی و ئایینی دەبێت کەوا ئەمرۆ لەسەر شانۆی جیهاندا دەبینرێت، بەستنەوەی (مقالاتی) زانستی پزیشکی و ئەندازیاری و تەنانەت فیزیاو کیمیاو فەلەک بە ئایەت و فەرمودەکان لە روانگەی ئایینەوە.

بەڕای من گۆڤارەکەتان کە ئەم بابەتانە بەخۆوە دەگرێت وەکو گۆڤاری رۆشنبیری و هونەری و زانستی تر وێستگەی حەسانەوەی دەبێت لە کاتێکدا خوێنەر هیلاک دەبێت. وەکو پێشبرکێی وەرزی بۆ پرسیار و وەڵام واتە موسلمانان و خوێنەران هەر پرسیارێکی ئایینیان هەبێت و وەڵام بدرێتەوە کە چەند پرسیارێک دەگرێتە خۆی و



پاشـانیش (وشـەی یـەکتریر) کـە هــەرجارەی وشـەیەکی ئـایینی و نـاوی خـواو پێغەمبـەر و قورئـان و ئایەتـەکان تەعبیر بکات، ئایا نەزانی پێم باشە لەگەڵ دەنگوباس و وتەکانی پیاو چاکان و ئـەدەبی ئیسـلامی و تەسەوف و شەریفەت و لاپەڕەو بەرهەمی ئافرەتان وەرگرتن هەواڵ و چالاکیە ئایینی یەکان لە کەناڵە فەزاییەکان بەتایبەتی کۆڕ و مێزگـرد کـە ئـەمرۆ بـە فراوانـی ئـەنجام دەدرێـت و ڕاستی یەکان ئاشکرا دەکرێت بلاو بکرێتەوە.

*** بەڕێز مامۆستا مەلاڕەسـول محەمـەد نـادر بەڕێوەبـەری ئەوقافی سلێمانی:-**



.گۆڤاری خۆری ئیسـلام لـە سـایەی کابینـەی سـێیەمی حکومـەت دەستکەوتێکی زۆر گەورەیە بۆ موسـڵمانان کـە وەرزانـە دەردەچێت ئەگـەر بتوانرایـە مانگانـە دەربکرایـە زیـاتر سـوودی لـێ وەردەگیرا، بەڕاسـتی زۆر بابـەت هەیـە لـە بوارەکـانی زانسـتی ئـایینی ئیسلامی وەکو پێویست نەخراوەتە بەردەستی موسـڵمانان، پێویسـتە (خـۆری ئیسـلام) ئـەم ڕاسـتیانە لـە لاپـەڕەکانی‌دا بڕازێنێتەوە، جگـە لـە بـوارە شـەرعیو ئایینی و تەفسیرو زمانی زانست بابەتی کەلەپورو مێژوو جوگرافیـاو جـەنگ و بازرگـانی و خوێنـدەواری بـەخۆوە بگرێت، ئەمرۆ کۆمەڵگاکەمان لە هەل و مەرجێکی خودی و بابـەتی دا مامەڵـە لەگـەڵ دەوروبـەری دا دەکـات و گەلەکەمان و هەموو هاونیشتمانی تری براکانی ماوەیەکی درێژە بەیەکـەوە دەژیـن و مێژوویـەکی هاوبەشیان هەیـە لـە بنیاتنانی کۆمەڵگای کوردەواری دا، هەروەها لـە بواری ئافرەت و ئیسلام و دادوەری و مەسـەلەی دابـەش کردنی میرات و مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکانی تر.. خۆری ئیسـلام دەبێ منبەری حـەق و ڕاستی بێت بـۆ تـەواوی موسـڵمانانی دەقەرەکـەو بـەبێ بۆچوونـی سیاسـی و نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی، هاوڵاتیان بتوانن هەرچی لە خزمەتی گەل و نیشتمان و ئایینەکەیانە بنووسن.

*** بەڕێز مامۆستا مەلا جەرجیس ئیبراهیم خدر ... ئیمام و خەتیبی مزگەوتی قەڵا لەشاری هەولێر.**



★ بە ڕاستی ئێمە ماوەیەکـە چـاوەڕوانی ئـەوەین کـە حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتـی ئـەوقاف گۆڤارێکی ئایینی لە خزمەتی ئـایینی پـیرۆزی ئیسـلام لـە کۆمـەڵگای کوردسـتان دەربکـەن کـە تیـایدا مامۆسـتایان و زانایـان و ڕۆشنبیرانی ئیسلام بە قەڵەمە بە پێزەکانیان زانیارییە بنچینەییـەکانی ئیسـلام بەتایبـەتی و ڕۆشـنبیری ئـایینی ئیسلام و هـەروەها هـونەرو کەلـەپووری مێژووی ئـایینی ئیسلام لـە سـەرەتای هاتنـە خوارەوەی ئـەم ئاینـە پاکـەو سـەرکردایەتی پێغەمبـەرمان (محەمـەد) (د.خ) لەپێشـڕەوی‌و بلاوکردنـەوەی ئـاین و هـەروەها وەرگێڕانـی ئایـەت و فـەرموودە پیرۆزەکـان بـە شێوەی زانستی نوێ و بابەتی تر تیایدا بلاوبکەنەوە.

بە بۆچوونی ئێمە لەبەرئەوەی گۆڤارەکـەتان بەسـێ مـانگ جارێک دەردەچێت واتـە وەرزیـە پێویسـتە لـە قەوارەو ژمارەیەکی وا بلاوبکرێتەوە بگاتە دەستی هەموو موسڵمانێک لـە هەموو مـاڵێک دا، ئەمەش کە لەلایـەن حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و وەزارەتـی ئەوقافـەوە بلاودەکرێتـەوە زیـاتر لایـەنی ئـایینی و نەتەوایـەتی و کۆمەڵایـەتی لەبەرژەوەندی ئـایینی ئیسـلام و موسـلمانان بێت و فرە بابەتو گۆشەی تایبـەتی بـەوەرگێڕانی تێدابێت کە لەلایەن زانـا ناودارەکانـەوە نووسراونەتەوە، گرنگی بـە **(مخطوطات)** و هەروەها پرسیارو وەڵام لە بواری ئایینی و عەدالەت لە ئیسلام و بابـەتی مێژوویی و ڕوونکردنـەوەی ڕاستی یەکان بخاتە ڕوو. وە لـە کۆتـایی دا پیرۆزبـایی لـە موسڵمانانو خۆمـان دەکـەین بەدەرچوونی یەکـەم ژمـارەی گۆڤـاری خـۆری ئیسـلام کەبەڕاسـتی خـۆری ئیسـلام لـە کوردسـتاندا کـە لەلایـەن حکومەتـەوە پشـتگیری لـێ دەکرێتو ببێتە پردی نێوان موسڵمانان.

# شمس الاسلام

مجلة ثقافية علمية إسلامية فصلية

يصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية




بسم الله الرحمن الرحيم

قَدْ جَاءَكُم مِّنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ
مُّبِينٌ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ
رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُم
مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ
وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ

صدق الله العظيم

وێنەی بەرگی دووەم: فارس سەعدی